# حوکمی مامەڵە ئەلکترۆنییەکان

نووسینی:

پرۆفیسۆر د. خالید موحەممد صاڵح

# حوكمی مامەڵە ئەلكترۆنییەكان

## دراوە ئەلكترۆنییەكان، بازارگەری تۆڕبەندی، بازاڕی ( Forex) و بازرگانی (Margin)

نووسینی

پرۆفیسۆر. د. خالید موحەممەد صاڵح

2019-1439

## باسی یەكەم:
## حوكمی مامەڵەكردن بە دراوە ئەلكترۆنییەكانەوە (OneCoin) بەنموونە

## باسی دووەم:
## حوكمی بەشداریكردن لە كۆمپانیاكانی (بازاڕگەری تۆڕبەندی) (Network Marketing) (التسويق الشبكي) (Qnet) بەنموونە

## باسی سێیەم:
## حوكمی مامەڵەكردن لە بازاڕی ( Forex) وكاركردن بە سیستەمی پەراوێزی بازرگانی (Margin)

## دەستپێك:

خۆشەویستان ئەم پەڕتووكە سێ توێژینەوەی زانستی لەخۆ دەگرێت لەسەر سێ بابەتی شەرعی، یاسایی، زانستی، دارایی، بازرگانی، ئابووری سەردەمییانە كە ماوەیەكە هەموو ئەو نێوەندانەیان بەخۆیانەوە سەرقاڵ كردووە ئەوانیش بابەتەكانی:

١- حوكمی مامەڵەكردن بە دراوە ئەلكترۆنییەكانەوە (OneCoin)بەنموونە.
٢- حوكمی بەشداریكردن لە كۆمپانیاكانی (بازاڕگەری تۆڕبەندی) (Network Marketing) (التسويق الشبكي) (Qnet) بەنموونە.
٣- حوكمی مامەڵەكردن لە بازاڕی (Forex) وكاركردن بە سیستەمی پەراوێزی بازرگانی (Margin).

بەر لەوەی بچمە سەر باسكردنی ناوەڕۆكی بابەتەكان پێم خۆشە سەرەتا چەند خاڵێك ڕوون بكەمەوە:

یەكەم: ئەم قسەو باس ونوسراوانەی ئێمە بۆ ئەو كەسانەیە كە حساب بۆ حەلاڵ وحەرام وسنورەكانی شەرع وقیامەتی خۆیان دەكەن ولە حەرامەكان دەگەڕێنەوە، ئەگینا ئەوانەی گوێ بە حەرام وحەلاڵ نادەن مەبست نین بەم بابەتانە وقسەكانیش ئاراستەی ئەوان نییە.

دووەم: هەر موسوڵمانێك دەیەوێت هەر كارێك بكات پێویستە سەرەتا بۆچوونی شەرعی لەسەر بزانێت و پاشان بڕیاری كردن یان نەكردنی بدات، نەوەك بڕوات كارەكە بكات و دواتر پرسی شەرع بكات، چونكە كەچویتە كارەكەوە ئەو كات واز هێنان قورسترە و زیانەكان زیاترن وجگە لەخۆت لەوانەیە خەڵكی تریش بەهۆی تۆوە تووشی حەرام و زەرەومەند بوبن.

سێیەم: شەرعی خوا لەسەرو حەز و بەرژەوەندی هەموو لایەكەوەیە و ئێمەیش بەرپرسیارین لەوەی كە شەرعی خوا چۆنە ئاوها بۆ خەڵكی ڕوون بكەینەوە، بۆیە جگە لەجێبەجێكردنی ئەو ئەركە شەرعییە من بەرژەوەنییەكی تایبەتم لەباسكردنی ئەم بابەتانەدا نییە، مەبەستیشم لێدانی بەرژەوەندی كەسێك یان كۆمپانیایەكی دیاری كراو نییە، چونكە ئەوە كاری من نییە و لەگەڵ هیچ بنەمایەكی ئەخلاقی و ئایینیش یەك ناكاتەوە، بگرە مەبەستی من ڕزگاركردنی ئەو گەنجە سادە و خەڵكە بێ ئەزموونەیە كەدەكەونە داوی

دەستبڕینی ئەم كۆمپانیایانەوە و وزە و تواناكانیان ئیفلیج دەكەن و داهات و دەستمایەكانیان بەهەدەر دەبەن ئەمە جگە لەوەی كەئەم جۆرە كۆمپانیایانە زیان بەئابوری و وڵاتیش دەگەیەنن و پارەیەكی بێ شوماری ئەم وڵاتە ڕەوانەی كۆمەڵێك ژمارەی حسابی نادیار وبانكی بێ ناسنامە دەكەن.

چوارەم: كاتێك دەڵێین كاری ئەو كۆمپانیایانە حەرامە مەبەستمان تۆمەتباركردنی خاوەنی كۆمپانیا یان بەشداربووانی نییە بەوەی لاڕێ وحەرام خۆر بن، چونكە زانایان لەكۆنەوە گوتویانە: (قد يقع الإنسان فى الكفر ولايقع الكفر عليه). واتا: هەندێك جار مرۆڤ دەكەوێتە كوفرەوە بەڵام كافر نابێت، چونكە لەوانەیە نەیزانیبێت، یان بەهەڵە كردبێتی، یان بەزۆر پێی كرابێت، یان هەر پاساوێكی شەرعی تری هەبێت، لێرەشدا قسەكە هەر وایە چونكە من زۆرێك لەبەشداربووانی ئەم جۆرە كۆمپانیایانە دەناسم خەڵكانی باش و دیندارن و زۆرێكیشان لەپاش ڕونكردنەوەكانی ئێمە وازیان لەكۆمپانیا هێناوە وئومێدەوارین هەموو ئەو بەڕێزانەی تریش كە پابەندن بەسنوورەكانی شەرعەوە وازیان لێ بهێنن و كاریان لەگەڵ نەكەن.

پێنجەم: فەتوادان كارێكی ئاسان نییە و بەهەموو كەس ناكرێت وپاشخانێكی زانستی فرە ڕەهەندی تۆكمەی پێویستە، تایبەت بەم جۆرە بابەتانەیش مرۆڤ دوو جۆر فیقهی پێویستە یەكەم (فیقهی واجب) كەبریتییە لەشارەزایی تەواو لەكۆی زانستە شەرعییەكان لەگەڵ (فیقهی واقیع) كەبریتییە لە تێگەیشتنی تەواوی ئەو بابەتەی كەدەیەوێت فەتوای لەبارەوە بدات چونكە (الحكم على الشيء جزء من تصوره) واتا: شێوازی تێگەیشتن لەهەر شتێك بەشێكە لەو بڕیارەی كەلەبارەیەوە گەڵاڵە دەبێت. هەریەك لەم دوو زانستەیش لای موفتی ناتەواو بوو بەدڵنیاییەوە بڕیارەكەیشی لاسەنگ و ناتەواو دەبێت.

بۆیە ناكرێت هەركەس هەستێت و فەتوای حەڵاڵی وحەرامی بۆ خەڵك بدات، گرفتی هەندێك لەو گەنجانەی لەگەڵ ئەم جۆرە كۆمپانیایانە كار دەكەن ئەوەیە هیچ شارەزاییەكی شەرعییان نییە و كەچی بەناوی شەرعەوە قسە دەكەن و فەتوا بۆ خۆیان وخەڵكیش دەدەن و دەمە دەمێ لەگەڵ شەرعزانان دەكەن كاتێكیش كەلێیان دەپرسیت بواری تایبەتمەندیت چییە دەڵێت شەشی سەرەتاییم تەواو كردوە یان دەرچوی فیزیا یان كیمیام یان هەر بابەتێكی

تر كە هیچ پەیوەندی بەزانستە شەرعییەكانەوە نییە و كە بچوكترین و سەرەتاییترین پرسیاری شەرعییان لێ دەكەیت لەوبارەیەوە لەنموونەی (ربا البیع، ربا القرض، الغبن، الغرر، التدلیس) و چەندین بابەت و زاراوەی تر كەڕو لاڵ دەبن و وەڵامیان پێ نادرێتەوە. بۆیە گرنگە مرۆڤ ڕێز لەتایبەتمەندی خۆی و خەڵكیش بگرێت و دەم لەشتێك وەر نەدات كەشارەزایی لەبارەوە نییە، چونكە ئەوە شەرعی خوایە و لەكەسی قبوڵ ناكات بەئارەزووی خۆی یان لەبەرژەوەندی خۆی بەكاری بهێنێت.

شەشەم: قەدەغەكردنی مامەڵە كردن لەگەڵ ئەم كۆمپانیایانە پەیوەندی بە خودی كاری كۆمپانیاكان و سیستەمی مامەڵەكەیانەوە هەیە، كەچی هەندێك لەهەڵسوڕاوانیان ئێمە بەوە تۆمەتبار دەكەن كە حەلاڵی خوا حەرام دەكەین و بێ شەرمانە ئەو ئایەتە بەڕووی ئێمەدا دەدەنەوە كە خوای گەورە دەفەرموویێت: (وَلَا تَقُولُوا لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ الْكَذِبَ هَٰذَا حَلَالٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ ۚ إِنَّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ)[١]. واتا: لەپێناو پینەكردنی درۆ وخراپەكانی خۆتاندا مەڵێن ئەوە حەلاڵە و ئەوە حەرامە و درۆ بەدەم خوای گەورەوە هەڵبەستن، ئەوانەی درۆ بەدەم خواوە هەڵدەبەستن لەسزای خوای گەورە دەرباز نابن.

بێ ئاگا لەوەی كە خوای گەورە لە ئایەتەكەدا تاوانی حەڵاڵكردنی ناڕەوای پێش حەرامكردن خستووە، ئەوان بەكێشەی نازانن كە حەارمی خوایان حەڵاڵ كردووە بەڵام بۆ ئێمە كێشەیە كە بەحەرام بڵێین حەرامە، لەكاتێكدا بابەتی حەرام حەڵاڵكردن قورسترە لە حەڵاڵ حەرام كردن.

چونكە شتە قەدەغەكراو و یاساغەكان لەشەرعدا دەبن بەدوو بەشەوە:

أ- محرم لذاته: بەو حەرامانە دەگوترێت كە هەر لەبنەڕەتدا حەرامن لەنموونەی عارەق و گۆشتی بەراز و زینا وتا دوایی.

---

١ - سورة النحل: الآیة (١١٦).

ب- محرم لغيره: بەو حەرامانە دەگوترێت كە لە بنەڕەتدا حەرام نین بەڵام بەهۆی كاتێك یان كەسێك یان كارێك یان شوێنێكەوە بۆ كاتێكی دیاری كراو حەرام دەكرێن، وەكو نوێژكردن لەزەوییەكی داگیركراودا، یان كڕین و فرۆشتن لەكاتی نوێژی هەینیدا.

بۆیە دەكرێت هەندێك حەڵاڵ بەپاساوی شەرعی حەرام بكرێت وەك ئەوەی لەبابەتی (محرم لغيره) ڕو دەدات، یان هەندێك جار دەكرێت حەڵاڵەكان بەرتەسك بكرێنەوە بەمەبەستی ڕێگریكردن لە خراپ بەكارهێنانی حەڵاڵەكان كە لەشەرعدا بە (سد الذرائع) ناوبراوە و یەكێكە لەسەرچاوەكانی حوكمی شەرعی.

كەواتە حەرام كردنی هەندێك لە حەڵاڵەكان بۆ هەندێك كار و كاتی دیاری كراو زیاتر ڕێی تێدەچێت لەحەڵاڵ كردنی حەرامەكان كە تەنها بۆ كاتی زۆر پێویست پەنای بۆ دەبرێت

.

هەر بۆیە پێغەمبەری خودا وا هاوەڵانی پەروەردە دەكرد كە هەمیشە مەودایەكی زۆر لەنێوان خۆیان و حەرامەكان بەجێ بهێڵن و پێشەوا عومەریش لەو بارەیەوە دەفەرموویێت: (كنا نترك تسعه أعشار الحلال مخافه أن نقع فى الحرام) واتا: ئێمە نۆ لە سەر دەی حەڵاڵ و شتە ڕێگەپێدراوەكانیشمان نەدەكرد لەترسی ئەوەی نەوەك تووشی حەرامێك ببین. كەچی ئێمە نەك حەڵاڵەكان ئێستا نۆ لەسەر دەی حەرامەكانیش دەكەین و هێشتا هەر خۆمان بەمەغدور دەزانین ودەمانەوێت یەك لەسەر دەكەی تریشی حەڵاڵ بكەین.

حەوتەم: هەندێك پاساو بۆ شەرعیەت پێدانی كاری ئەو كۆمپانیایانە باس دەكرێت كە هیچ سەنگێكی لەتەرازووی شەرعدا نییە و ناكرێت بكرێتە بەڵگەی ڕێگەپێدان لەوانە: دۆزینەوەی هەلی كار بۆ گەنجان، یان زۆری قازانجی كارەكەیان، یان بەربڵاوی كارەكەیان لەزۆرێك لەووڵاتان. بۆیە كاتێك ئێمە دەڵێین ئەمانە حەرامن، دەپرسن: باشە ئەمانە حەرامن وەرن هەلی كاری حەڵاڵمان بۆ بدۆزەرەوە.

بەڕێزان ئێمە بەرپرس نین لەوەی هەلی كاری حەڵاڵ بۆ ئێوە بدۆزینەوە، بەڵام تەنها ئەوەندە بزانن كە خوای گەورە بژێوی ژیانی هیچ كەسێكی لەسەر ڕزق و ڕۆزی حەرام دانەناوە، بەڵام ئێوە بۆخۆتان هەوڵ نادەن بەشوێن كاری حەڵاڵدا بگەڕێن و ئەنجامی بدەن، ئەمە وەك ئەوە وایە بەكەسێك بڵێیت زینا مەكە، بڵێت دەی ژنێكم بۆ بهێنە. ئەوە كەی كاری

ئێمەیە، كاری ئێمە ئەوەیە تۆ سنوری حەڵاڵ و حەرام بزانیت و دواتر خۆت سەرپشكیت لەوەی چی دەكەیت و بەگوێی كێ دەكەیت و هەر خۆیشت بەرامبەر خوای گەورە و قیامەتی خۆت بەرپرسیاریت.

هیچ كام لەم پاساوانەیش ناكرێت بكرێنە بەڵگەی شەرعییەت پێدان بۆ هیچ مامەڵەیەكی شەرعی.

بۆیە هەر بەرێزێك ئەم پەرتووكە دەخوێنێتەوە گرنگە سەرەتا ئاگای لەو خاڵانە بێت.

هەشتەم: تێبینی كۆتاییم سەبارەت بە دابەشكردنی بابەتەكانی توێژینەوەكەیە كە من بۆ هەر یەكێك لەو بابەتانە باسێكی تایبەتم تەرخان كردووە و تێیدا هەموو ئەو چەمكانەم ڕوونكردۆتەوە كە خوێنەر پێویستی پێیەتی بۆ تێگەیشتنی بابەتەكان و بونیادنانی حوكمە شەرعییەكان، هەر لە پێناسەوە تا كۆتایی و دەرەنجامەكان، بەڵام سەبارەت بەڕاسپاردەكان وبەهۆی نزیكی بابەتەكان لەیەكترەوە و بۆ خۆ لادان لەدووبارەكردنەوەی خاڵەكان ڕاسپاردەكانی هەرسێ باسەكەم بەیەك گوژمە لەكۆتایی باسی سێیەمدا تۆمار كردووە.

ئێستایش دەچینە سەر باسكردنی ناوەڕۆكی بابەتەكان و بۆ هەریەكێك لەو بابەتانە باسێك تەرخان دەكەین وسەرەتا لەدراوی ئەلكترۆنییەوە دەستپێدەكەین.

# باسی یەکەم:
# حوکمی مامەڵەکردن
# بە دراوە ئەلکترۆنییەکانەوە
# (OneCoin)بەنموونە

- پێشەکی.
- تەوەری یەکەم: سەرەتایەک لەسەر (OneCoin).
- تەوەری دووەم: پێناسەی (OneCoin).
- تەوەری سێیەم: حوکمی مامەڵەکردن بە (OneCoin) وەک دراوێکی ژمارەیی.
- تەوەری چوارەم: حوکمی مامەڵەکردن بە (OneCoin) وەک پاکێجێکی فێرکاری.
- تەوەری پێنجەم: بەڵگەکانی بانگەشەکارانی (OneCoin).
- تەوەری شەشەم: بۆچوونی زانایان لەسەر مامەڵەکردن بە (OneCoin)ەوە.

## پێشەكی:

سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان، درود و سڵاو بۆ سەر گیانی پاكی پێغەمبەری ئیسلام و یار وشوێنكەوتوانی بەگشتی.

خۆشەویستان ئاشكرایە سەدەی (٢١) سەدەی شۆڕشی تەكنەلۆجیا و كورتكردنەوەی ڕێگاكان و ئاسانكردنی ئەركەكانە، ئەم شۆڕشە گۆڕانكاری ڕیشەیی و بەرچاوی بەسەر ژیانی تاك وكۆمەڵگاكاندا هێناوە نەك تەنها لە بوار یان ئاستێكی دیاریكراودا بەڵكو لە هەموو بوارەكانی ژیان و لەگشت ئاستەكاندا، بواری ئابوری وبازرگانی ودارایيش یەكێكە لەو بوارانەی كە شۆڕشی تەكنەلۆجیا گۆڕانكاری بەرچاوی بەسەردا هێناوە.

لەدیارترینی ئەو گۆڕانكاریانەیش لەو بوارەدا سەرهەڵدانی سیستەمی ( Crypto Currency) ودراوی ژمارەیی وگریمانەییە، ئەمەیش شتێكی ئاسایی و خوازراوە چونكە تا مامەڵەكان زۆر تر و زیاتر بن ئاسانكاری وئاسایشی زیاتریان پێویستە لەجێبەجێكردنندا، هەر بۆیە بەدرێژایی مێژوو و هاوكات لەگەڵ پێشكەوتنی كۆمەڵگاكاندا مرۆڤ زۆر شێواز و ڕێكاری جیاوازی بۆ ئاڵوگۆڕی بازرگانی گرتۆتە بەر، هەر لە گۆڕینەوەی كاڵاكان و دواتر داهێنانی دراوی ئاڵتون و زیو وەك نرخی كاڵاكان و دواتر دروستكردنی دراوی كاغەز وكانزایی لەوێنەی دینار و دۆلار و یۆرۆ... وەك بەهایەكی مەعنەوی ئاڵتون و زیو، تادەگاتە داهێنانی چەكی بانكی و كۆمپیالە و دروستكردنی ڤیزە كارت و ماستەر كارت و تاكار گەیشتە دراوی ئەلكترۆنی وژمارەیی.

بۆیە سەرهەڵدانی دیاردەی دراوی ئەلكترۆنی شتێكی ئاساییە و لەوانەیە پێداویستییەكی هەنووكەیی ئەم سەردەمەیش بێت كە ژیان زۆر بەخێرایی گوزەر دەكات و پێداویستییەكانیشی سات بە سات لەگۆڕانكاری وگەشەكردندایە و مامەڵە داراییەكانیش تا بێت لەڕووی چەندێتی

و چۆنێتییەوە زیاتر و گەورەتر دەبن، بەڵام ئەوەی لێرەدا و لە ئێستادا ئاسایی نییە شێواز و سەرچاوە و ڕێکارە شەرعی و یاساییەکانی دەرکردن و مامەڵەپێکردنی ئەم جۆرە دراوانەیە.

بابەتی ئەم توێژینەوەیەیش تایبەتە بە بەدواداچوون و هەڵسەنگاندنی یەکێك لەو دراوانە کە ماوەیەکە نێوەندە شەرعی و زانستی و بازرگانییەکانی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردوە کەئەویش دراوی گریمانەیی ئەلکترۆنی (OneCoin) ە.

گرنگی ئەم بابەتەیش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە:

١- بابەتێکی هەنووکەی و هاوچەرخە و لەسەردەمی زانایانی کۆندا بوونی نەبووە و لەهیچ پەرتووکێکی فیقهیدا باسی لێوە نەکراوە، بۆیە تێگەیشتن و بڕیاردان لەبارەیەوە پێدەچێت ئاسان نەبێت وهەموو کەس توانای تێگەیشتن و شیکردنەوەو بڕیاردانی لەبارەیەوە نەبێت.

٢- خەڵکانێکی نەشارەزا و ناپسپۆڕ خۆیان کردۆتە خاوەنی باسەکە و قسەی لەسەر دەکەن و فەتوای سەیرو سەمەرەی لەبارەوە دەدەن و خۆیشیان و خەڵکیش گومڕاو سەرلێشێواو دەکەن.

٣- ئەم بابەتە مەترسی بۆ سەر داهات و دارایی تاك و کۆمەڵ دروست دەکات وبڕێك زۆر لەداهاتی نیشتمانی هەناردەی دەرەوەی وڵات وکۆمەڵێك ژمارە حیسابی نادیار دەکات وتواناکانی گەنج بەتەواوی لەکار دەخات وبەهرەکانیان دەمرێنێت ودەیانکاتە بەکاربەرێکی بێبەرامبەر بۆ کۆمپانیا وناوەندە بازرگانییە گوماناوییەکان.

بۆیە ئاگادارکردنەوەی خەڵکی بەتایبەتی چینی گەنجان لەم جۆرە پرۆژە گوماناوی و وەهمیانەی کە جگە لەماڵوێرانی سوودێکی تری بۆیان نابێت زەرورەتێکی شەرعی و واقیعیە.

میتۆدی نوسینی توێژینەوەکەیش میتۆدێکی وەسفی شیکارییە و تێیدا قسە لەسەر مێژوو وبنەماکانی بیرۆکەکە و ئامرازەکانی و شێوازی ئەنجامدانی و مەترسییەکانی و حوکمە شەرعییەکەی دەکەین.

سەبارەت بە پەیکەری توێژینەوەکە: توێژینەوەکە لە شەش تەوەر پێك دێت: تەوەری یەکەم سەرەتایەکە لەسەر (OneCoin)، تەوەری دووەم پێناسەی (OneCoin) لەخۆ دەگرێت، تەوەری سێیەم دەربارەی حوکمی مامەڵەکردنە بە (OneCoin) وەك دراوێکی

ژمارەیی، تەوەری چوارەم تایبەتە بە حوکمی مامەڵەکردن بە (**OneCoin**) وەك پاکێجێکی فێرکاری، لە تەوەری پێنجەمدا بەڵگەکانی بانگەشەکارانی (**OneCoin**) دەخەینە ڕوو و گفتوگۆیەکی زانستییانەیان لەسەر دەکەین، تەوەری شەشەم و کۆتاییش تایبەت دەکەین بە بۆچوونی زانایان لەسەر مامەڵەکردن و بازرگانیکردن بە دراوی (**OneCoin**) ە وە.

## تەوەری یەکەم:
## سەرەتایەک لەسەر (OneCoin)

سەرەتای ئاشنابوونم بەم دراوە دەگەڕێتەوە بۆ مانگی (٣) ساڵی (٢٠١٧) کاتێك هەندێك لەهەڵسوڕاوانی (**OneCoin**) پەیوەندییان پێوەکردم ودەربارەی حومکی شەرعی مامەڵە کردن بەو دراوەوە پرسیان پێکردم.

هەر سەرەتا من بەڕوونی پێم گوتن کە من مامەڵەکردن بەو جۆرە دراوانە وبەوشێوازەی ئێستای بەشەرعی نازانم وگرفتی زۆری تێدا دەبینم، بەڵام ئەوان قەناعەتیان نەکرد وهەر بۆیە سێ جار و لەسێ کاتی جیادا وبۆچەند کاژێرێك دانیشتنمان کرد وبەڵام بەداخەوە دانیشتنەکانمان بێسوود بوون چونکە ئەوان هەر سوور بوون لەسەر بەردەوام بوون لەسەر کاری خۆیان.

هەر بۆیە هەرکەس پەیوەندی بەمنەوە کردبێت بۆ ئەو مەبەستە و ویستبێتی بەشداری تێدا بکات ڕاشکاوانە پێم گوتوە حەرامە وکاری وا نەکات، بەڵام ئەم بۆچوونەی خۆم بۆ ڕای گشتی بڵاو نەکردەوە، ئەویش بەخاتری ئەوەی کە هەندێك دۆستی خۆشەویست ومامۆستای بەڕێز پێشنیاری ئەوەیان کرد کەسەردانێکی (د.عەلی قەرەداغی) بکەین کە ئەو کات لەکوردستان بوو، بابەتەکە لەگەڵ بەڕێزیشیان تاوتوێ بکەین، وبۆچونی ئەویش لەو بارەیەوە بزانین وئەوجا بۆچوونی خۆمانی لەسەر بڵاوبکەینەوە.

ئەوەبوو لەگەڵ كۆمەڵێك پسپۆڕ وشارەزای بوارەكانی (شەریعە وئای تی، وئابووری) شەوی (٢٠١٧ /٥/٢٣) سەردانی جەنابی دكتۆرمان كرد ولەنزیكەوە تاوتوێی ئەو باسەمان لەگەڵ كرد و بەر لەئێمەیش ئەو برادەرانەی كەسەرقاڵی كارەكە بوون چەند جار قسەیان لەگەڵ كردبوو.

پاش گفتوگۆیەكی زۆر لەگەڵ بەرێزیان ئەو گوتی: هەرچەند بابەتەكە گومان وئاڵۆزییەكی زۆری لەسەرە بەڵام من ناتوانم لە ئێستادا بڵێم حەرامە وپێویستم بەلێكۆڵینەوەی زیاترە.

منیش عەرزم كرد: كە بڕیار لەسەر ئەم بابەتە دواكەوتن هەڵناگرێت؛ چونكە ڕۆژانە بەكاربەرانی ئەو دراوە خەڵكی نوێ تێوەدەگلێنن وفریویان دەدەن و دواتریش ئەو خەڵكانە ئەگەر وازیش بهێنن توشی زیانی زۆر دەبن، بۆیە ڕێكەوتین لەسەر ئەوەی كە بەڕێزیان لەئێستادا و تا ئەوكاتەی بۆیان یەكلا دەبێتەوە فەتوا بدەن كەبەكاربەرانی (OneCoin) چالاكییەكانیان ڕابگرن وبانگەشەی بۆ نەكەن وداوایش لەهاووڵاتیان بكات پەیوەندیان پێوە نەكەن و بەڵێنیشی پێداین كە لەماوەی سێ ڕۆژ بۆ هەفتەیەك پاش گەڕانەوەی بۆ قەتەر بڕیاری كۆتایی لەو بارەیەوە دەدات و هەر ئەو شەوەیش لەلاپەڕەی فەرمی خۆی ئەم فەتوایەی بڵاو كردەوە: (ڕوونكردنەوەیەك لەلایەن دكتۆر عەلی قەرەداغی سەبارەت بەمامەڵەكردن لەگەڵ دراوی ئەلكترۆنی (OneCoin) دكتۆر عەلی قەرەداغی ئەمینداری گشتی یەكێتی جیهانی زانایانی موسڵمان پاش ئەوەی دوو كۆبونەوەی لەگەڵ لایەنگرانی بەشداری دراوی ئەلكترۆنی (OneCoin) كردو وگوێی بۆ ڕاو بۆچونەكانیان گرت، دواتریش لەگەڵ كۆمەڵێك لە ئابوریناس و مامۆستای زانكۆ و بانگخواز و زانایانی ئایینی كۆبونەوەی كرد و گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوە لەسەر بابەتەكە كرا سەبارەت بەپێناسە و ئەوانەی لەپشت ئەم كارەوەن وسودوقازانجی بۆ هەرێمی كوردستان وئایا ئەم مامەڵەیە لەڕووی شەرعییەوە حەڵاڵە یان حەرامە؟

لەكۆتایی بینینی هەردوو گروپەكەدا دكتۆر عەلی قەرەداغی گوتی: داوا لەموسوڵمانان دەكەم كە مامەڵە كردن لەگەڵ دراوی ئەلكترۆنی (OneCoin) ڕابگرن و پەیوەندییان پێوە

نەكەن، لە ئایندەیەكی نزیكیشدا پاش توێژینەوە و وەرگرتنی ڕای زانایان و پسپۆڕانی بوارەكە فەتوایەكی شەرعی لەم بارەیەوە دەردەكەین)[٢].

پاش دیدارەكە و وەكو ڕێزێك بۆ جەنابیان ئیتر من هیچم لەوبارەوە بڵاو نەكردەوە وهەر چاوەڕوانی وەڵامی ئەو بووم و ناوبەناو بەتەلەفۆن یان بەبینین ولەڕێی كەسە نزیكەكانییەوە یادمان دەخستەوە كە ئێمە و خەڵكانێكی زۆری تریش چاوەڕوانی وەڵامی بەڕێزیانین، بەڵام ئەو هەر وەڵامی نەبوو، یەك دووجار لەكەناڵی جەزیرە وهەندێك جاریش لەهەندێك چاوپێكەوتنی ڕۆژنامەوانی كەقسەی لەسەرئەو بابەتە دەكرد هەر هەمان بۆچونی یەكەمجاری دەگوت و بەڕونی نەیدەگوت حەرامە و هەر داوای ئەوەی دەكرد خەڵك بەشداریان لەگەڵ نەكات تا لێكۆڵینەوەی زیاتری لەبارەوە دەكات.

لەو ماوەیەشدا بەكاربەران وهەڵسوڕێنەرانی دراوەكە كە هەندێكیان لە جەنابی دكتۆریشەوە نزیك بوون، هیچ ڕێزێكیان بۆ فەتواكەی ئەو دانەنا وبەردەوامبوون لەسەر كار وچالاكی خۆیان و خەڵكانێكی زۆری تریان تێوەگلاند و ڕۆژانە كۆڕ و سیمیناری گشتی و تایبەتیان دەگرت و بەشداربووانیان زیادی دەكرد، لەبەرامبەریشدا فشارەكان ڕۆژانە لەسەر ئێمە زیادی دەكرد وپەیتا پەیتا خەڵك تەلەفۆنی دەكرد وداوای بۆچونی ئێمەیان دەكرد، كەدەمانگوت حەرامە، دەیانگوت ئەگەر وایە بۆ بێدەنگن و بەئاشكرا قسە ناكەن وبۆخەڵكی ڕوون ناكەنەوە.

من لەسەر بەڵێنەكەی خۆم تا پێنج مانگ چاوەڕوانی وەڵامی جەنابی دكتۆرم كرد بەڵام بێسوود بوو، ئیتر بڕیارمدا چیتر چاوەڕوانی نەكەم و بۆ یەكەم جار وبەندە وەك یەكەم كەس بەڕوونی حەرامی مامەڵە كردنم بەو بەناو دراوە ئەلكترۆنییەوە ڕاگەیاند وزنجیرە باسێكم لە پێنج بەش لەبەروارەكانی (٢٠١٧/٩/٣٠) (٢٠١٧/١٠/١) (٢٠١٧/١٠/٢) (٢٠١٧/١٠/٣) (٢٠١٧/١٠/٤). لەسەر بڵاوكردەوە وگشت بەڵگەكانیشم لەو بارەیەوە خستە ڕوو، چونكە وەكو پێشەوا ئەحمەد دەفەرمووێت: (ئەگەر شارەزایان بێدەنگ بوون وخەڵكی سادەیش نەزانن ئەی كەی حەق وڕاستی دەردەكەوێت)[٣].

---

٢ - پەڕەی فەرمی د. عەلی قەرەداغی، ٢٠١٧/٥/٢٣. https://ar-ar.facebook.com/alqaradghi

٣ - أبو يعلى (أبو الحسين ابن أبي يعلى)، طبقات الحنابلة، ج٢، دار المعرفة، بيروت، ص٢٧٩.

پاش بڵاو بوونەوەی بابەتەكە بەشداربوانی (**OneCoin**) زۆر نیگەران بوون و هاواریان لێ هەستا و هەندێكیان توشی هستیریا بوون وهەر لەبڵاوبونەوەی یەكەم بەشی باسەكە زیاتر لە (٢٠٠) كۆمێنتیان لەسەر بابەتەكە نووسی كەبەداخەوە زۆربەی زۆری كۆمێنتەكان تۆمەت بەخشینەوە و قسەی هەرزە ومناڵانە وئاست نزم بوون و بەدەگمەن تێبینی یان سەرنجێكی زانستی لەسەر بابەتەكە تێدا بوو، تەنانەت هەندێك بەناو ڕۆشنبیرو وفەریكە سیاسی و خوێندەواریان هەبوو كە پۆستی باڵایشیان هەبوو لەوەڵامی نووسراوەكەی مندا زۆر ناشیرین پێناسەی خۆیان كردبوو، كە ئەگەر لەبەر حورمەتی ئاستی زانستی بابەتەكەی خۆم نەبوایە كە ناوی ئەوان لەشكۆی كەمدەكاتەوە ناوم دەبردن وكۆمێنتەكانیشیانم وەك خۆی لێرە دادەنا.

بەهەر حاڵ هەندێك لەوانە بەردەوامبوون لە پێناسەكردنی خراپی خۆیان و منیش بەردەوام بووم لەسەر ڕوونكردنەوەی ڕاستییەكان و بنكەنكردنی هەرەمی هیوا وەهمییەكانیان.

ئەمە لەكاتێكدا كەئەوان خۆیان لەسەرەتادا دەستپێشخەریان كرد و هەندێك لە بەناو (**top leader**) ە كانیان هاتنە لام و دەربارەی شەرعییەتی كارەكە ڕاوێژیان پێكردم، بەڵام كەزانیان بۆچونی من لەبەرژەوەندی ئەوان نییە ئیتر لەبری ئەوەی وەڵامی زانستی بەڵگەكانم بدەنەوە كەوتنە تۆمەت بەخشینەوە ودروستكردنی گومان لەسەر مەبەستەكانم نەك خودی بۆچوون و بەڵگەكانم.

هەرچەندە بەندە هەرچیم گوتوە لەوبارەیەوە لەبری یەك بەڵگە دەیەها بەڵگەی شەرعیم لەسەری هەبووە، وبەئاشكرا و بەدەنگی بەرز و لەپەیجی تایبەتی خۆم و دەیەها كەناڵی ئاسمانی و لۆكاڵی و كۆڕوسیمینارردا قسەكانم كردوە و بەڵگەكانم خستۆتە ڕوو ، هەموو كاتیش ئامادەیی خۆم نیشانداوە بۆ دانیشتن و گفتوگۆ لەگەڵ هەركەسێك كە بۆچونی جیاوازی هەیە لەوبارەیەوە.

هەر بۆ نموونە: لە (٢٠١٧/١٢/٢) لە كەناڵی ئاسمانی ڕوداو پەیوەندییان پێوە كردم بۆ بەشداریكردن و قسەكردن لەسەر بابەتی دراوی گریمانەیی (**OneCoin**) لەبەرنامەی (مژاری ئابووری) لەگەڵ بەڕێز (م. دارا كەریم مەحموود )[٤].

---

٤ - دەتوانن لەڕێی ئەم بەستەرەوە بینەر وبیسەری دەقی ئەو چاوپێكەوتنە بن:

. https://www.youtube.com/watch?v=_qTkpaqqgy4

دواتر و لە (٢٠١٧/١٢/٥) لە ڕادوێی دواڕۆژ پەیوەندیان پێوەكردم بۆ بەشداریكردن لەدیبەتێك لەگەڵ كاك (هۆمەر پاڵكانە) لەسەر هەمان بابەت[٥].

پاش ئەوانیش لقی گەرمیانی ئینستتیوتی ژیار لەبەر زۆری بەشداربوانی دراوی (OneCoin) لەكەلار داوایان كرد كە سیمینارێك لەكەلار ساز بكەین و ڕوو بەڕوو گفتوگۆ لەگەڵ ئەو بەڕێزانە لەو بارەیەوە بكەین، منیش پێشنیارەكەم قبوڵ كرد و لەبەرواری (٢٠١٨/١/١١) سیمنارێكم لەكەلار لەسەر ئەو بابەتە پێشكەش كرد[٦].

ئێستایش من هەموو لایەك دڵنیا دەكەمەوە كەهیچ بەرژەوەندییەكی تایبەتی دونیایی و كەسیم لەم بابەت وبۆچونەمدا نییە و نەبووە، بگرە بەپێچەوانەوە منیش پێم خۆش بوو حەڵاڵ بوایە وئەو هەموو لێڵی و گومان و مەترسییەی تێدا نەبوایە تا خەڵكانێك لێی سوودمەند بوونایە، بەڵام بەداخەوە كە بەپێچەوانەوەیە هەر بۆیە بەرژەوەندی گشتی وخەمی قیامەتی خۆم و خەڵك و خاك و ئابوریی نەتەوە ونیشتمان لەپێشترە؛ چونكە مامەڵەكردن بەم جۆرە بەناو دراوە و هاوشێوەكانیەوە مەترسییەكی زۆریان تێدایە وپارەیەكی بەلێشاوی هاوڵاتیانی ئەم هەرێمە هەناردەی چارەنووسێكی وون و نادیار دەكات.

لەكۆتایی ئەم دەستپێكەدا پێم خۆشە جەخت لەسەر یەك خاڵ بكەمەوە كە هەر لەسەرەتاوە گوتومە وبەردەوامیش دووبارەم كردۆتەوە كەمن بەهیچ شێوەیەك دژی سیستەمی دراوی ژمارەیی نیم و پێیشم حەرام نیە بەڵكو بەپێچەوانەوە پێم وایە داهاتوو بۆ دراوی ژمارەیی دەبێت؛ بەڵام بەپێی پێودانگە شەرعی ویاساییەكان نەك بەرژەوەندی كۆمپانیا وەهمییەكان؛ بۆیە ئەم قسانەی من لە ئێستادا لەسەر ئێستای دراوێكی تایبەتە كە ناوی (OneCoin) ە و كاتێكیش دەڵێین مامەڵە كردن لەگەڵ (OneCoin) بەم شێوەیە حەرامە واتای ئەوە نییە كە تاقیامەت ئەم حەرامە هەر بەردەوام دەبێت، بەڵكو هەركات كۆمپانیای

---

٥ - دەتوانن لەڕێی ئەم بەستەرەوە بیسەری دەقی ئەو چاوپێكەوتنە بن:

https://www.youtube.com/watch?v=vl٧TxJdLL٧U.

٦ - دەتوانن لەڕێی ئەم بەستەرەوە بینەر و بیسەری دەقی ئەو سیمینارە بن:

https://www.youtube.com/watch?v=hA٥s٧bEfT.I.

(OneCoin) بەكارەكەیدا چوەوە ولەگەڵ بنەماكانی ئابووری ئیسلامی و مامەڵە شەرعییەكان گونجاندی ئەو كات ئێمەیش گرفتێكمان لەگەڵی نابێت.

## تەوەری دووەم
## پێناسەی (OneCoin)

بەر لەوەی بچینە سەر پێناسەی (OneCoin) با سەرەتا لە پێناسەی دراوەوە دەست پێبكەین بزانین دراو چییە؟. و چۆن بەرهەم دەهێنرێت؟. و مەبەست لەبەرهەمهێنانی چییە؟.

دراو (Currency) بریتییە لە شێوازێكی بەرجەستەو قبوڵكراو لە پارە كە لە جۆری پارچەی كانزایی یاخود كاغەزیدایە و لەلایەن حكومەتێكەوە دەردەكرێت و لەناو سیستەمێكی ئابووریدا بەكار دەهێنرێت.

دراو وەكو نێوەندگیرێك بەكار دەهێنرێت بۆ مامەڵەكان و بە بنەمای بازرگانی كردن دادەنرێت.

لە كاتی بەرهەم هێنانی دراودا ژمارە بچوكەكانی دراوەكە بۆ نمونە چارەكی، یاخود یەك لە سەدی دراوەكە بە شێوازی كانزایی بەرهەم دەهێنرێت و پێی دەوترێت (كۆین).

كریپتۆ كەرەنسی (Crypto Currency): بریتییە لەپیشەسازی چوارەمی دراوی جیهانی كە دراوێكی ژمارەیی تەشفیركراوە و هیچ حاڵەتێكی فیزیكی و بەرجەستەبووی نییە و لەڕێی هێڵە پێشكەوتووەكانی ئینتەرنێتی دوو بەرهەم دەهێنرێت و پشت بە سیستەمی (Blockchain) دەبەستێت و لەمامەڵە بازرگانییەكاندا بەكار دەهێنرێت و تا ئێستا نزیكەی (١٧٠٠) دراوی ژمارەیی لەبازاڕەكاندا بوونیان هەیە.

ئەم جۆرە دراوانە هیچ حكومەتێك خاوەنی نییە. هەر بۆیە بەهاكەی زۆر بە خێرایی لە گۆرانكاریدایە و لە ژێر هیچ جۆرە پاراستن و چاودێرییەكدا نییە.

هۆکاری سەرەکی سەرهەڵدانی ئەم جۆرە دراوانە لەبنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ کەمکردنەوەی تێچوونەکانی حەواڵەو نێوەندگیری، هەروەها خۆ قوتارکردن لە چاودێری یاسایی بۆ مامەڵە داراییەکان.

بەڵام هۆکاری گەشەکردنی خێرای لەئێستادا بۆ خاڵی کۆتایی دەگەڕێتەوە کە خواستی باندەکانی مافیا و وتۆڕەکانی تیرۆر وسپیکردنەوەی پارە وبازرگانیکردن بەمرۆڤ ومادەهۆشبەرەکان وهاکەرزەکانە لەسەر دۆزینەوە و دروستکردنی دراوێك کە دوور بێت لەچاوی یاسا و هەر لێپێچینەوە و بەدواداچونێکی دەزگا فەرمییەکانی دارایی دەوڵەت بۆ داهات و سەرچاوە نادیار و گوماناوی و یاساغەکانی ئەوان، تا لەکۆتاییدا ئامانجی وونیان لەدراوی ئەلکترۆنیدا دۆزیەوە؛ هەر ئەوەیش هۆکاری سەرەکی بەرزبوونەوەی خەیاڵی نرخی هەندێك لەو دراوانەیە.

یەکەم دراوی ژمارەیی کە کەوتە بازاڕەوە ساڵی (٢٠٠٩) دراوی (Bitcoin) بوو کە لەلایەن (ساتوشی ناکوموتو) وە دروستکرا و سەرەتا نرخەکەی بە (٠,٠١$) دەستی پێکرد و لە (٢٠١٨) دا نرخەکەی گەیشتە (١٩٠٠٠$).

پاش ئەو و لەساڵی (٢٠١١) دا دراوی لایت کۆین (LiteCoin) کەبە دراوی زیوی ناسراوە کەوتە بازاڕەوە، پاش ئەو و لە ساڵی (٢٠١٥) دا دراوی ئیسریۆم (Ethereum) کەوتە بازاڕەوە. پاش ئەوانیش چەندین دراوی تر سەریان هەڵدا تا کار گەیشتە (OneCoin).

ساڵی (٢٠١٤) یەکێکی تر لەو دراوانە سەری هەڵدا بەناوی (OneCoin) ە وە، کە لەلایەن دوو کۆمپانیای ئۆفشۆر[٧] ە وە بەرهەم هێنراوە بەناوەکانی:

(OneCoin Ltd) لەدوبەی.

(OneLife Network Ltd) لە بێلیز لە رۆژهەڵاتی ئەمریکای ناوەراست.

---

٧ - بریتییە لە کۆمپانیایەك کە کەسێك لە وڵاتێکی تر دایدەمەزرێنێت کە تیایدا یاساکانی باج ئاسانە و لە وڵاتەکانی خۆیاندا رێگایان بۆ دەکاتەوە کە سەرمایەی کۆمپانیاکانیان بگوازنەوە و هەر کەس بیەوێت ببێتە خاوەنی کۆمپانیایەکی ئۆفشۆر لە وڵاتی بێلیز یاخود لە دوبەی تەنها بە بری (٦٠٠$) و لە ماوەی تەنها (٣) رۆژدا دەتوانێت ئەو کارە بکات.

هەردوو كۆمپانیای ناوبراو بەسەرپەرشتی خانمێكی بولگاری بەناوی ڕۆژا ئیگناتۆڤا (Ruja Ignatova) كار دەكات و شەش نووسینگەی لەجیهاندا هەیە و نووسینگەی سەرەكی كۆمپانیاكە لە بولگاریایە و نووسینگەیەكیشی لە دوبەی هەیە.

سەبارەت بە ڕێكارەكانی ئەندامبوون لە كۆمپانیا سەرەتا پێویستە ناوی خۆت تۆمار بكەیت و ببیتە ئەندامێكی كارا و لەبەرامبەر ئەمەیشدا پێویستە (٣٠) یۆرۆ بدەیتە كۆمپانیا.

سێرڤەرەكانی كۆمپانیای ناوبراو لەتوانایدایە (٢،١) ملیار (Coin) بەرهەم بهێنێت بۆیە لەم ڕووەوە زۆر پێش دراوی (Bitcoin) دەداتەوە كە سێرڤەرەكانی توانای بەرهەمهێنانی تەنها (٢١) ملیۆن (Bitcoin) ی هەیە و لەئێستادا (OneCoin) زیاتر لە سێ ملیۆن بەشدابووی هەیە. لەساڵی (٢٠١٦) دا كۆمپانیا بانگەشەی ئەوەی دەكرد كە خاوەنی دووەم گەورەترین دراوی ژمارەیی جیهانە و (١٢٠) ملیار یەكەی فرۆشراوی هەیە.

هەر چەندە (OneCoin) یش بەشێكە لەسیستەمی (Crypto Currency) و بەقسەی بانگەشەكارانی و بۆ خۆپاراستن لەهەر بەكارهێنانێكی نایاسایی سیستەم و سەكۆی (بەكاربەرەكەت بناسە) (KYC) بەكار دەهێنێت، كە سیستەمێكی نامۆیە بە دراوی ئەلكترۆنی، هەر بۆیە تا ئێستا (OneCoin) لەنێوان ئەو دراوە ژمارەییانەدا بوونی نییە كە لە پێگەی (Coin Market Cap) تۆمار كراون كە پێگەیەكی تایبەتە بەبەدواچونی كار وبەهاكانی دراوە ئەلكترۆنییەكان.

ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت كە (OneCoin) تەنانەت لەنەخشەی دراوی ئەلكترۆنیشدا بوونی نیە، ولەهیچ بۆرسەیەكی جیهانیدا وەكو دراو مامەڵەی لەگەڵ ناكرێت وهیچ كام لەمەرجەكانی دراوبوونی تێدا نییە كەبریتیین لەوەی دراو:

١- دەبێت ئامراز بێت بۆ ئاڵوگۆڕكردنی كاڵاكان.

٢- پێوەر بێت بۆ نرخ وبەهای كاڵا وخزمەتگوزارییەكان.

٣- دەوڵەت یان دەزگایەكی دارایی باوەڕ پێكراو دەری بكات وپشتیوانی لێ بكات.

٤- هەبووی هەبێت وخەڵكی بتوانن مامەڵەی پێوە بكەن وبەكاری بهێنن.

٥- پێكهاتەی كانزایی دراوەكە شەرعی بێت.

هەر دراوێکیش ئەم مەرجانەی تێدا نەبوو ئەوە بەدراو ئەژمار ناکرێت وبەداخیشەوە لە ئێستادا هیچ کام لەم مەرجانە لە (OneCoin) دا بوونیان نیە.

هەر بۆیە بانگەشەکارانی (OneCoin) لەئێستادا وەك چەند پاکێجێکی فێرکاری مامەڵەی پێوە دەکەن و دەیفرۆشن و پاکێجەکانیشیان بەگشتی (٧) پاکێجە و ئاستی جیاواز ونرخی جیاوازیان هەیە ونرخەکانیان لە (١١٠) یۆرۆوە دەست پێ دەکات تا دەگاتە (٢٧٥٠٠) یۆرۆ، وەنرخی هەموو پاکێجەکانی پێکەوە دەکاتە (٥٩٣١٠) یۆرۆ واتا نزیکەی حەوت دەفتەر دۆلار.

لەگەڵ هەر یەك لەو پاکێجانە کۆمپانیا بڕێك (تۆکن) وەك دیاری دەداتە بەشداربووانی، بۆنموونە بۆ پاکێجێکی (١١٠) یۆرۆیی کۆمپانیا (١٠٠٠) تۆکن دەدات، بەڵام بۆ پاکێجێکی (٢٧٥٠٠) یۆرۆیی کۆمپانیا (٣٠٠٠٠٠) تۆکن دەدات. وئەو (تۆکن) انە پاش تێپەڕبوونیان بە کۆمەڵێك قۆناغ وبەرنامەی ئاڵۆزدا دەبنە (Coin) ودەچنە سەر هەبووی خاوەن پاکێجەکان.

بەشداربووانی سیستەمەکە جگە لە قازانجی پاکێجەکان و بەناو دراوەکان، هەر کەس کڕیارێکی نوێ بۆ کۆمپانیا پەیدا بکات و لە ڕێی بەستەرەکەی خۆیەوە ناوی تۆمار بکات و بیهێنێتە سیستەمەکەوە کۆمپانیا لەبەرامبەردا (١٠٪) نرخی پاکێجی فرۆشراوی ئەو ئەندامە نوێیەی پێدەدات، تا کڕیاری زیاتریش پەیدا بکات ڕێژەی قازانجی زیاد دەکات؛ ئەمە جگە لە قازانجی نەوەکانی تر کە لەڕێگەی ئەو نەوەیەوە بەشداری دەکەن کەلەڕێگەی ئەمەوە بەڕاستەوخۆ بەشداری سیستەمەکەیان کردووە، هەر بۆیە بانگەشەکارانی و لەپێناو زیادکردنی قازانجی خۆیان بەردەوام لەهەوڵدان تا زۆرترین کەس تێوەبگلێنن.

خاڵی جیاکەرەوەی سەرەکی ئەم جۆرە دراوانە و دراوی ئاسایی ئەوەیە کە ئەم دراوانە هەبووی بەرجەستەبوویان نییە و تەنها کۆمەڵێك تەلیسم و ژمارەی گریمانەیین و سەر بەهیچی دەوڵەت یان دامەزراوەیەکی دارایی خاوەن سەنگ و باوەڕپێکراو نین و دوور لەچاوی یاسا و دەزگاکانی چاودێری دارایی کار و چالاکییەکانیان ئەنجام دەدەن و مەترسییەکی زۆریان لەسەرە و بەهاکانیان زۆر بە خێرایی گۆڕانکارییان بەسەردا دێت، هەر بۆیە زۆرێك لەووڵاتان لە ئێستادا بەتوندی دژایەتی دەکەن ومامەڵەپێوەکردنیان بەیاساغ لەقەڵەم دەدەن.

كۆمپانیای وەبەرهێنی (OneCoin) و هەڵسوڕاوانی لە چەندین وڵاتی دونیا لە نموونەی ئەمریكا و ئەڵمانیا و بەریتانیا و ئیتاڵیا و بەلژیكا و هەنگاریا و هیندستان كێشەی یاساییان هەیە و لەچەندین وڵاتیش بنكەو بارەگاكانیان داخراوە.

لەم دواییانەشدا و بەدیاریكراوی لە (٢٠١٩/٣/٦) و لەفڕۆكەخانەی لۆس ئەنجلۆس نووسینگەی لێكۆڵینەوە فیدراڵییەكانی ئەمریكا (FBI) قوستەنتین ئیگناتۆڤای بەڕێوەبەری كارگێڕی (OneCoin) و برای (Ruja Ignatova) ی بەرپرسی یەكەمی پرۆژەی (OneCoin)ی بە تۆمەتی پلانگێڕی بۆ كاری ساختە و دزی و فێڵی ئەلكترۆنی و دروستكردنی كۆمپانیای وەهمی و شۆردنەوەی پارە دەستگیركرد[٨].

---

٨ - بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەم بابەتە سەیری ئەم توێژینەوە و بەستەرانە بكە:

.https://drive.google.com/file/d/0B1tr6WIdzmFVSGdCRzBDUGw4SHc/view

.https://www.alarbcoin.com/٢٠١٦/٠٦/Onecoin.html

.https://www.borsaforex.com/،https://www.albayan.ae/opinions/articles/٢٠١٧-١٢-٢٥-١,٣١٤١٦٠٢

.http://onelifearabic.blogspot.com/٢٠١٧/

https://www.hespress.com/hi-tech/336583.html

https://thealkhabir.blogspot.com/2016/05/onecoin.eu.html

،https://slideplayer.com/slide/١٣٠٦٢٨١٣/

http://pharmakone.blogspot.com/2016/12/blog-post_18.html

.https://www.bestmlmmarketing.com/

.http://www.dictionary.com/browse/ponzi

.https://www.sec.gov/fast-answers/answersponzihtm.html

.http://www.apintertrust.com/offshore_company/belize_tax_haven.htm

.http://www.nasdaq.com/article/survey-malaysians-warm-up-to-cryptocurrencies-bitcoin-still-on-top-cm٧٩٨١٤٦

..https://cointelegraph.com/news/one-coin-much-scam-onecoin-exposed-as-global-mlm-ponzi-scheme

## تەوەری سێیەم
## حوکمی مامەڵەکردن بە (OneCoin) وەک دراوێکی ژمارەیی

وەك پێشتر گوتمان (OneCoin) لەبنەڕەتدا دراوێکی ئەلکترۆنییە و بەشێکە لەسیستەمی (Crypto Currency) و شێوەی دراوەکە و گشت زانیارییەکانی لەپەیجی فەرمی کۆمپانیا بوونی هەیە و بازاڕێکیشیان هەیە بەناوی (Dealshaker) بۆ کڕینی کاڵا بە (OneCoin) و بەکاربەرانی هەمیشە بە (Bitcoin) بەراوردی دەکەن.

سەرەڕای ئەمانە هەمووی بەکاربەرانی دراوەکە بەهۆی نەبوونی متمانە بەداهاتووی دراو و پرۆژەکە و بۆ خۆدزینەوە لە چەند پرسێکی شەرعی لە ئێستادا و هەر بەرپرسیارێتییەکی یاسایی لەداهاتوودا وای وێنا دەکەن کە (OneCoin) تەنها کاڵایەکە و لەچەند پاکێجێکی فێرکاری پێك دێت و ئەو بڕە پارەیەی لەبەشداربوو وەردەگیرێت تەنها لەبەرامبەر فێربوونی بەکارهێنانی سیستەمەکەیە و هیچی تر.

ئێمەیش لێرەدا و لەپێناو ڕوونکردنەوەی باسەکە بەشێوازێکی زانستی و گشتگیر بەهەردوو گریمانەکە قسە لەسەر درووستی و نادرووستی دەکەین و بۆ هەر گریمانەیەکیان تەوەرێك تەرخان دەکەین و ئەم تەوەرە تەرخان دەکەین بۆ گریمانەی یەکەم.

بەپێی گریمانەی یەکەم کە گوتمان ڕاستتر و زانستی ترە (OneCoin) دراوێکی گریمانەیی ژمارەییە وبەشێکە لەسیستەمی (Crypto Currency) یان بۆ ئەو مەبەستە کاری لەسەر دەکرێت.

لەم ڕووەوە ئەم دراوە کۆمەڵێك گرفتی شەرعی یاسایی و تەکنیکی تێدایە کە هەر یەکێکیان بەسە بۆ ئەوەی قەدەغە ویاساغی بکەن بەڵام ئەو هەموو ئەوانەی پێکەوە تێدایە، ئەو گرفتانەیش بریتین لە:

١. لەبەر ئەوەی (OneCoin) دراوە کەواتە لەکاتی مامەڵە پێوەکردنی پێویستە هەموو مەرجە شەرعییەکانی مامەڵەکردنی دراوی تێدا بێت.

مەرجی سەرەکی مامەڵەکردنی شەرعیش بەهەر دراوێکەوە ئەوەیە کە دەبێت لەکاتی ئاڵوگۆڕکردنی بەدراوێکی تـر هەردووکیان دراو بن وئامادەی ڕادەستکـــردن بـــن چ بەخۆی

چ لەرێگەی چەكی بانكی یان هەر ئامرازێكی ترەوە كە وەك ئەو وابێت و نرخی ئەوی هەبێت. خۆ ئەگەر یەكێك لەدراوەكان ئامادە نەبوون یان هەبووی تەواویان نەبوو ئەوە یەكسەر مامەڵەكە دەبێتە سوو و دروست نیە.

ئەم مەرجەیش لە ئێستادا لە (OneCoin) دا بوونی نییە؛ چونكە نەبوەتە دراوێكی فەرمی ولەكاتی مامەڵەپێوەكردنی سەرەتا خۆی لەچەند تۆكنێكدا دەبینێتەوە و دواتر ئەو تۆكینانە پاش چەند قۆناغێك دەبنە (Coin) وتەنانەت بەهای پاش بە (Coin) بوونیان شاراوەیەو نەزانراوە، بۆیە مامەڵە پێوەكردنی جۆرێك لە سوو دروست دەكات كەزانایان پێی دەڵێن (ربا النسیئة) واتا: سووی ئامادە نەبوونی یەكێك لەدراوەكان.

ئەم بنەمایەیش نەك تەنها (OneCoin) بەڵكو هەموو ئەو شتانە دەگرنەوە كە دراون یان حوكمی دراو وەردەگرن وەك ئاڵتون، زیو، دراوی كاغەز، چەكی بانكی، تەنانەت كۆمپیالە و هەر شتێكی تریش كە وەك دراو مامەڵەی پێوە بكرێت بەدراوی ژمارەییشەوە. چونكە شەرع مامەڵە لەگەڵ ناوی شتەكان ناكات بەڵكو ناوەڕۆكیان بۆیە هەر شتێك خەڵكی وەك دراو تەماشای بكەن ومامەڵەی پێوە بكەن هەمان حوكمی دراوی شەرعی وەردەگرێت وبەهەمان شێوەیش مامەڵەی لەگەڵ دەكرێت.

پێشەوا مالیك دەڵێت: (وَلَوْ أَنَّ النَّاسَ أَجَازُوا بَيْنَهُمْ الْجُلُودَ حَتَّى تَكُونَ لَهَا سِكَّةٌ وَعَيْنٌ لَكَرِهْتُهَا أَنْ تُبَاعَ بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ نَظِرَةً)[٩]. واتا: ئەگەر خەڵكی ڕازیبوون بەوەی بەپێستی ئاژەڵ مامەڵە بكەن و كردیانە دراو و سكەیان پێ لێدا، پێم باش نییە بە ئاڵتون و زیو مامەڵەی پێوە بكرێت ویەكێكیان (ئاڵتون وزیوەكە یان پێستەكە لەكاتی ئەنجامدانی گرێبەستەكەدا ئامادە نەبن.

ئیبن وتەیمیەیش لەو بارەیەوە دەڵێت: (وأما الدرهم والدينار فما يعرف له حد طبعي ولا شرعي بل مرجعه إلى العادة والإصطلاح؛ وذلك لأنه في الأصل لا يتعلق المقصود به، بل الغرض أن يكون معيارا لما يتعاملون به)[١٠]. واتا: درهەم و دینار پێناسەیەكی سروشتی یان شەرعی دیاریكراویان

---

٩ – الإمام مالك، المدونة، ج٣، دار الكتب العلمية، بيروت، ط٥، ١٤١٥، ص٥.

١٠ – ابن تيمية (أحمد بن عبد الحليم)، مجموع الفتاوى، ج١٩، مجمع الملك فهد لطباعة المصحف الشريف، المدينة المنورة، ط، ١٩٩٥، تحقيق : عبد الرحمن بن محمد بن قاسم ص٢٥٢.

نییە، بەڵکو دەگەڕێنەوە بۆ دابونەریت و زاراوەی خەڵکی، چونکە لەبنەڕەتدا خۆیان مەبەست وئامانج نین، بەڵکو ئامرازن و ئامانج لێیان ئەوەیە کەببنە پێوەر بۆ مامەڵەکانیان.

ئەم مەرجەیش کۆدەنگی زانایانی لەسەرە و ئەمەیش بەڵگەکانیانە:

أ- پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: {الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ، وَالْفِضَّةُ بِالْفِضَّةِ،....يَدًا بِيَدٍ، فَإِذَا اخْتَلَفَتْ هَذِهِ الْأَصْنَافُ فَبِيعُوا كَيْفَ شِئْتُمْ إِذَا كَانَ يَدًا بِيَدٍ}[11]. واتا: ئاڵتون بەئاڵتون، زیو بەزیو.....دەست بەدەست، خۆ ئەگەر ئەم جۆرانە جیاواز بوون ئەوکات چۆنتان پێ باش بوو ئاوها بیفرۆشن، بەمەرجێك دەست بەدەست بێت.

ب- پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: {لاَ تَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ إِلاَّ مِثْلا بِمِثْلٍ.....وَلا تَبِيعُوا غَائِبًا مِنْهَا بِنَاجِزٍ}[12]. واتا: ئاڵتون بە ئاڵتون مەفرۆشن مەگەر ڕێژەکەیان وەکو یەك بێت....وە ئەگەر یەکێك لەکاڵاکان ئامادە نەبوو مەیفرۆشن.

ت- عن سليمان بن أبي مسلم قال: سَأَلْتُ أَبَا الْمِنْهَالِ عَنْ الصَّرْفِ يَدًا بِيَدٍ؟. فَقَالَ: اشْتَرَيْتُ أَنَا وَشَرِيكٌ لِي شَيْئًا يَدًا بِيَدٍ وَنَسِيئَةً، فَجَاءَنَا الْبَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ فَسَأَلْنَاهُ، فَقَالَ: فَعَلْتُ أَنَا وَشَرِيكِي زَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ، وَسَأَلْنَا النَّبِيَّ ﷺ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: {مَا كَانَ يَدًا بِيَدٍ فَخُذُوهُ، وَمَا كَانَ نَسِيئَةً فَذَرُوهُ}[13]. واتا: سولەیمانی کوڕی باوکی موسلیم دەڵێت: لەباوکی مینهالمان پرسی: مەبەستی دەست بەدەست لەکڕین و فرۆشتندا کە لە فەرموودەکاندا هاتووە چییە؟. گوتی: من و هاوەڵێکم مامەڵەمان دەکرد، وهەندێك جار دەست بەدەست کاڵاکانمان ڕادەست دەکرد و هەندێك جاریش بەقەرز، کاتێك بەرائی کوڕی عازب هات بۆ لامان لێمان پرسی، ئەویش گوتی: من و زەیدی کوڕی ئەرقەم هاوبەش بووین، ودەربارەی ئەو بابەتە لەپێغەمبەری خودامان ﷺ پرسی، ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی: ئەوەی دەست بەدەست دەیگۆڕنەوە دروستە و وەری بگرن، بەڵام ئەوەی دەکەوێتە قەرزەوە ویەکێك لەدراوەکان ئامادە نییە، وازی لێبێنن.

---

١١ – مسلم (مسلم بن الحجاج) ، صحيح مسلم، ج٣، دار إحياء التراث العربي، بيروت، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي، ص١٢١٠، رقم الحديث (١٥٨٧).

١٢ – البخاري (محمد بن إسماعيل)، صحيح البخاري، ج٣، دار طوق النجاة، ط١،١٤٢٢، تحقيق: محمد زهير بن ناصر، ص٧٤، رقم الحديث (٢١٧٧). مسلم، صحيح مسلم، ج٣، ص١٢٠٨، رقم الحديث (١٥٨٤)، واللفظ للبخاري.

١٣ – البخاري، صحيح البخاري، ج٣، ص١٤٠، رقم الحديث (٢٤٩٧).

ث- عَنْ مَالِكِ بْنِ أَوْسٍ قَالَ: أَقْبَلْتُ أَقُولُ مَنْ يَصْطَرِفُ الدَّرَاهِمَ فَقَالَ طَلْحَةُ: أَرِنَا الذَّهَبَ حَتَّى يَأْتِيَ الْخَازِنُ ثُمَّ تَعَالَ فَخُذْ وَرِقَكَ. فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: كَلاَّ وَالَّذِى نَفْسِى بِيَدِهِ لَتَرُدَّنَّ إِلَيْهِ ذَهَبَهُ، أَوْ لَتُنْقِدَنَّهُ وَرِقَهُ، فَإِنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ : {الذَّهَبُ بِالْوَرِقِ رِبًا إِلاَّ هَا وَهَا، وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ رِبًا إِلاَّ هَا وَهَا}[١٤]. واتا: مالیكی كوڕی ئەوس دەڵێت: دەگەڕام دەمگوت كێ زیوی هەیە بیفرۆشێت، تەڵحەی كوڕی عوبەیدوڵلا گوتی: ئاڵتونەكەتمان نیشان بدە، تا ژمێریارەكەمان دێت كەهات وەرە زیوەكەی خۆت وەرگرە، پێشەوا عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) گوتی: بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە شتی وا نابێت، یان ئاڵتونەكەی بۆ دەگێڕیتەوە، یان هەر ئێستا زیوەكەی دەدەیتێ، من گوێم لە پێغەمبەری خودا ﷺ بوو دەیفەرموو: گۆڕینەوەی ئاڵتون بەزیو دەبێتە سوو ئەگەر دەست بە دەست نەبێت، گۆڕینەوەی گەنم بە گەنم دەبێتە سوو ئەگەر دەست بە دەست نەبێت.

ج- ئیبن هوبەیرە دەڵێت: (أجمع المسلمون على أنه لا يجوز بيع الذهب بالذهب منفرداً، أو الورق بالورق تبرها، ومضروبها، وحليها إلا مثلاً بمثل، وزناً بوزن، يداً بيد)[١٥]. واتا: موسڵمانان كۆدەنگن لەسەر ئەوەی فرۆشتنی ئاڵتون بەئاڵتون بەتەنها، یان زیو بەزیو، خۆڵ ودراو وخشڵیان دروست نییە بفرۆشرێت، مەگەر وەكو یەك بن و یەك كێشیان هەبێت و یەكسەریش ڕادەست بكرێن.

ح- هەروەها كۆمكاری فیقهی ئیسلامی لەبڕیاری (٩٣)ی كۆنگرەی یازدەیدا دەڵێت: (لايجوز شرعا البيع الآجل للعملات، وهذا بدلالة الكتاب والسنة وإجماع الأمة)[١٦]. واتا: لەڕووی شەرعییەوە فرۆشتنی دراو بەقەرز دروست نییە و ئەمەیش بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و كۆدەنگی زانایان.

ئەمانە مشتێكن لەخەرمانی ئەو بەڵگانەی كە دەیسەلمێنن هەر دراوێك لەكاتی مامەڵە پێوە كردنیدا ئامادە نەبێت، ئەو مامەڵەیە دەبێتە سوو، جا هەرچەندە (OneCoin) بەدراو ئەژمار دەكرێت وكۆمپانیا وەبەرهێنەكەی وەك دراو نمایشی دەكات و بازاڕی بۆ دەكات، بەڵام

١٤ – البيهقي(أحمد بن الحسين)، السنن الكبرى، ج٥، مجلس دائرة المعارف النظامية الكائنة في الهند ببلدة حيدر آباد، ط١، ١٣٤٤، ص٢٨٣، رقم الحديث (١٠٨١٤). إبن حبان (محمد بن حبان)، صحيح إبن حبان، ج١١، مؤسسة الرسالة، بيروت، ط٢، ١٩٩٣، تحقيق: شعيب الأرنؤوط، ص٣٩٤، رقم الحديث (٥٠١٩). وقال شعيب الأرنؤوط في تخريجه: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

١٥ – إبن هبيرة (يحيى بن هبيرة بن محمد)، اختلاف الأئمة العلماء، ج١، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤٢٣،٢٠٠٢، ص٣٥٨، تحقيق: السيد يوسف أحمد.

١٦ – مجلة المجمع الفقهي الإسلامي، العدد الحادي عشر، ج١، ص٤٣١، قرار رقم: ١٠٢(١١/٥).

ئەم دراوە لە ئێستادا نە ئامادەیە ونەبوونیشی هەیە بەڵام بەڵێنێك هەیە كە لەداهاتوودا دەبێتە دراو ئەویش هیچ كەس لەئێستادا ناچێتە ژێر بەرپرسیارێتی ئەوەی كە ئەو بەڵێنە دەچێتە سەر یان نا و بانگەشەكارانیشی بۆ خۆپاراستن لەهەر لێپێچینەوەیەكی یاسایی دەڵێن: ئێمە بەڵێنی ئەوەمان بەهیچ كەس نەداوە كە ئەمە لەداهاتوودا دەبێتە دراو یان ڕەت دەكرێتەوە وپوچەڵ دەبێتەوە.

٢- یەكێكی تر لە گرفتەكانی ئەم بەناو دراوە نادیاری داهاتووەكەیەتی كە كەس نازانێت (OneCoin) لەداهاتوودا دەبێتە دراوێكی ئاسایی ویاسایی ودەچێتە بۆرسە یان پوچەڵ دەبێتەوە وهەڵدەوەشێتەوە. یاخود ئەو (تۆكن)انەی كەلەگەڵ پاكێجەكاندا هەن لەداهاتوودا چەند (Coin) دەكەن لەبەر ئەوەی نرخی (Coin) ە كان جێگیر نین و بەردەوام گۆڕانكارییان بەسەردا دێت.

ئەم بەرچاو لێڵی ونادیاریەیش هۆكارێكی تر بۆ حەرامبوونی مامەڵەكە زیاد دەكات؛ چونكە دەچێتە ڕیزی ئەو مامەڵانەی كە لە شەرعدا پێی دەگوترێت (الغرر).

(الغرر) لە ڕووی زمانەوانییەوە بە واتای مەترسی یاخود شاراوەیی دێت، لەڕووی زاراوەییشەوە زانایان سێ پێناسەی بۆ دەكەن كە بریتیین لە: مامەڵەكردن بەهەر شتێك كە شاراوەیی و مەترسی تێدا بێت و چارەنووسی نادیار بێت. پێشەوا بوجەیرمی لەو بارەیەوە دەڵێت: (الغرر هوما انطوت عنا عاقبته، أو تردَّد بين أمرين أغلبهما أخوفهما)[١٧]. واتا: غەرەر بریتییە لەو شتەی كە داهاتوویەكی نادیار و شاراوەی هەیە، یان دوو ئەگەری هەیە زاڵەكەیان ترسناكترینیانە.

ئەو (OneCoin) ە یش كە ئێمە باسی دەكەین هەموو ئەو سیفەتانەی تێدایە، چونكە شاراوەیی و نادیاری زۆری پێوە دیارە و داهاتوویەكی ناڕوون و پڕ مەترسی هەیە و هیچ گرەنتییەكی یاساییش نیە بۆ پاراستنی خاوەن پشك و كڕیارەكان لای كۆمپانیا.

(الغرر) یش شێوازێكە لە شێوازەكانی قومار و ئیبن و تەیمییە لەبارەیەوە دەڵێت: (النبي ﷺ حرم أشياء داخلة فيما حرمه الله في كتابه، فإن الله حرم في كتابه الربا والميسر، وحرم النبي ﷺ بيع

١٧ - البجيرمي (سليمان بن محمد بن عمر البجيرمي)، حاشية البجيرمي على شرح المنهج، ج٢، مطبعة الحلبي، ١٩٥٠، ص١٨٣.

الغرر، فإنه من نوعِ الميسر)[18]. واتا: پێغەمبەری خودا ﷺ هەندێك شتی قەدەغە ویاساغ کردوە دەچنە ژێر ئەوانەی کە خوای گەورە لە قورئاندا حەرامی کردوە، ئەوەتا خوای گەورە لەقورئاندا سو و قوماری قەدەغە کردوە، وپێغەمبەری خودایش ﷺ فرۆشتنی (الغرر) ی یاساغ کردووە کە شێوازێکە لە شێوازەکانی قومار.

٣- گرفتێکی تری ئەم جۆرە دراوانە ئەوەیە کە هیچ دەوڵەتێك یان دامەزراوەیەکی دارایي خاوەن سەنگ و باوەڕپێکراو پشتگیری ناکات بەڵکو چەند کۆمپانیایەکی گومانلێکراویان لەپشتەوەیە و هەرکاتیش گرفتێك ڕوودات یان سیستەمە ئەلکترۆنییەکەی تێك بچێت یان هاك بکرێت بەشداربووان نازانن یەخەی کێ بگرن وسکاڵا لەسەر کێ تۆمار بکەن.

٤- گرفتێکی تری ئەم بەناو دراوانە ئەوەیە کە لە دەرەوەی دەسەڵاتی یاسا و دەوڵەت بەرهەم دەهێنرێن و دروست دەکرێن و ئەمەیش جگە لەوەی ئابووری و دارایی و دراوی وڵات دەخاتە مەترسییەوە گرفتی بشێوی بازرگانی و هەڵئاوسانی ئابووری و بواری ساختەکاری زۆر دەرەخسێنێت؛ هەربۆیە زانایانی شەریعەت و یاسایش لەکۆنەوە کاری دروستکردن و دەرکردنی دراویان تایبەت کردوە بەدەوڵەتەوە. پێشەوا ئەحمەد لەو بارەیەوە دەڵێت: (لا يصلح ضرب الدراهم إلا في دار الضرب بإذن السلطان، لأن الناس إن رخص لهم في ذلك ركبوا العظائم)[19]. واتا: درووستکردنی دراو بەبێ مۆڵەتی دەسەڵات و لەدەرەوەی شوێنی تایبەت بەدروستکردنی دراو دروست نییە؛ چونکە ئەگەر خەڵکی مۆڵەتی ئەوەیان پێبدرێت کارەسات بەسەر خەڵکی دەهێنن. پێشەوا نەوەویش دەڵێت: (إن ضرب النقود من أعمال الإمام)[20]. واتا: لێدان و دروستکردنی پارە لەکارەکانی دەسەڵاتە. ئیبن خەلدونیش دەڵێت: (والسلطان مكلف بإصلاح السكة والاحتياط عليها والاشتداد على مفسديها)[21]. واتا: دەسەڵات بەرپرسیارە لەچاکردن و درووستکردنی دراو و دانانی یەدەك لەسەری و ئاگالێبونی و سزادانی ئەو کەسانەی خراپ بەکاری دەهێنن یان زیانی پێ دەگەیەنن.

---

١٨ - إبن تيمية (أحمد بن عبد الحليم)، الفتاوى الكبرى، ج٥، دار المعرفة، بيروت، ط١، ١٣٨٦، ص١٠٣، تحقيق: حسنين محمد مخلوف.

١٩ - أبو يعلى (محمد بن الحسين بن محمد)، الأحكام السلطانية، دار الكتب العلمية، بيروت، ط٢، ٢٠٠٠، تحقيق: محمد حامد الفقي، ص١٨١.

٢٠ - النووي، روضة الطالبين، ج٢، ص٢٥٨.

٢١ - إبن خلدون، المقدمة، ج١، دار إحياء التراث العربي، القاهرة، ص٥٢٦.

بۆيە لەم ڕووەيشەوە لێدان ودروستكردنى ئەم جۆرە بەناو دراوانە ياساغ وحەرامن.

٥- گرفتێكى ترى ئەم بەناو دراوانە ئەوەيە كەپارەى كاش بەدەستى خەڵك ولەبازاڕدا ناهێڵێت وڕەوانەى كۆمەڵێك ووڵات وژمارەى گوماناوييان دەكات و لەبەرامبەردا كۆمەڵێك ژمارەى ئەلكترۆنى وتەليسميان پێ دەدات.

كەواتە لەبەر ئەم هۆكارانەو بەو بەڵگانەى كەباسمان كرد مامەڵە كردن بەدراوى گريمانەيى (OneCoin) ە وە دروست نييە وحەرامە.

ئێستا دەچينە سەر گريمانەى دووەم كە ئەگەر (OneCoin) وەك كالآيەك يان پاكێجێكى فێركارى تەماشا بكەين ئايا لەو ڕووەوە گرفتى هەيە يان نا؟!.

## تەوەری چوارەم
## حوکمی مامەڵەکردن بە (OneCoin) وەک پاکێجێکی فێرکاری

بەپێی گریمانەی دووەم کە گوتمان ئەگەر (OneCoin) کۆمەڵێك پاکێجی فێرکاری بێت کە ئەمە دوورە لەڕاستییەوە و پەنابردن بۆ ئەم پاساوەیش فریایان ناکەوێت وشەرعییەت بەکارەکەیان نادات؛ بەڵام سەرەڕای ئەوەیش با لەسەر ئەم گریمانەیەیش لەگەڵیان بڕۆین وبڵێین (OneCoin) پاکێجی فێرکارییە، بەم گریمانەییش (OneCoin) چەندین گرفتی شەرعی و یاسایی هەیە کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- ئەم قسەیە دوورە لە ڕاستی ولۆژیکی عەقڵەوە و درۆیە؛ چونکە (OneCoin) لەبنەڕەتدا دراوە و بەشێکە لەسیستەمی (Crypto Currency) وکڕیارانیشی بەو مەبەستە دەیکڕن وچاوەڕوانی ئەوەی لێدەکەن و وەك ڕکابەری (Bitcoin) تەماشای دەکەن و بانگەشەی بۆ دەکەن و شەرعیش مامەڵە لەگەڵ ناوەڕۆکی شتەکان دەکات نەك ناوەکانیان، وگۆڕینی ناو حوکمی ناوەڕۆك ناگۆڕێت، هەروەك چۆن کەسێك بەعارەق بڵێت شیر بە گۆڕینی ناوەکەی عارەقەکە حەڵاڵ نابێت و وەك شیر مامەڵەی لەگەڵ ناکرێت؛ چونکە ناوەڕۆکەکەی هەر عارەقە و حەرامە لێرەشدا گۆڕینی ناوی (OneCoin) لە دراوەوە بۆ پاکێجی فێرکاری حەڵاڵی ناکات و هەر حەرامە.

٢- ئەگەر (OneCoin) پاکێجی فێرکارییە بۆچی سێرڤەرەکانی ڕێژەیەکی دیاریکراو و سنوردار بەرهەم دەهێنن و دواتر دەوەستن و نرخەکەیان بەهۆی زیادبوونی خواستی کڕین لەسەریان بەشێوەیەکی خەیاڵی بەرز دەبنەوە، ئەم قسانە لەگەڵ چ شتێکی پاکێجی فێرکاریدا یەك دەگرنەوە، یاخود چ پاکێجێکی فێرکاری بەم شێوەیە سنووردارە و تەنها ڕێژەیەکی دیاریکراوی هەیە و خەڵکانێکی سنووردایش دەتوانن لێی سوودمەندو بەهرەمەند بن.

٣- ئەگەر (OneCoin) پاکێجی فێرکارییە بۆچی ئەو جیاوازییە زۆرە لەنێوان نرخی پاکێجەکانیدا هەیە، لە (١١٠) تا دەگاتە (٢٧٥٠٠) یۆرۆ، ئایا جیاوازی ئاستی زانست و زانیاری پاکێجەکان ئەوەندە فراوانە، ئەمە لە کاتێکدا کە هاوشێوەی ئەو پاکێجە فێرکارییانە لەشوێنی تر نرخەکەیان لە نێوان (١٨-٥٠$) دایە.

٤- باشە ئەگەر ئەمانە پاكێجی فێركارین ئەوكات دەبێت ئاستی ڕۆشنبیری و زانستی ئەو كەسانەی كە پاكێجەكان دەكڕن زۆر باڵا بێت وخاوەنی بڕوانامەی تایبەت بن لەو بوارەدا چونكە تێگەیشتن و كاركردن لەو جۆرە سیستەمەدا كارێكی ئاسان نییە و خوێندەوارییەكی باشی دەوێت؟!! دواتریش دەبێت بەپێی گرانی وهەرزانی پاكێجەكان ئاستی خوێندەواری بەشداربووان جیاواز بێت. بەڵام ئایا هیچ كام لەمانە بوونی هەیە لە واقیعدا؟!! بەدڵنیاییەوە نەخێر چونكە زۆرێك لەبەشداربوانی پڕۆژەكە هەر نەخوێندەوارن یاخود ئاستی خوێندەوارییان زۆر نزمە، وكەسیش لەئاستی خوێندەواری كەس ناپرسێت وهیچ كۆرسێكی فێركاریش بوونی نیە، ئەو قسانە تەنها بۆ خۆدزینەوە ودەربازبوونە لەحوكمە شەرعییەكان.

ئەگینا كەی ڕاستە خولی فێركاری حەفتا هەزار دۆلاری بەخەڵكی نەخوێندەوار بگوترێتەوە؟!!!.

٥- باشە ئەگەر (OneCoin) پاكێجی فێركارییە ئەی دواتر ئەم پاكێجانە چ سوود وقازانجێكیان هەیە وكێ دەیانكڕێتەوە بەو قازانجە خەیاڵییانەی بەكاربەرانی باسی دەكەن و بەشداربوانی پرۆسەكەی پێ فریودەدەن؟!!! كێ بینیویەتی پاكێجی فێركاری دواتر سەد هەزار بەرامبەری خۆی قازانج بكات؟!!! یان باشە بۆ خەڵك پاكێجی فێركاری لەئێوە دەكڕێتەوە بۆ ناچێت وەكو ئێوە ڕاستەوخۆ لەكۆمپانیای بكڕێتەوە؟!!!. باشە كێ هەیە لەم قەیرانەدا حەوت دەفتەر دۆلار بداتە پاكێجێكی فێركاری كە هیچ ئیشی پێی نییە؟!!! بۆیە بەداخەوە ئەمانە هەمووی قسەی بێ بنەمان ودوورن لەڕاستیەوە.

٦- ئەگەر (OneCoin) پاكێجی فێركارییە كەس هەیە پاش وەرگرتنی پاكێجە فێركارییەكە لەسیستەمەكە بێتە دەرەوە و بڵێت من تەنها مەبەستم فێربوون بووە وهیچی تر.

٧- ئەوان دەڵێن لەدووتوێی پاكێجە فێركارییەكاندا هەندێك (تۆكن) هەیە كە وەك دیاری وشتێكی لاوەكی دەبەخشرێتە كەسی بەشداربوو، ئەمەیش كەسی بەرامبەر وا تێدەگەیەنێت كە كڕیار لەبەر پاكێجەكە خۆی كاڵاكە دەكڕێت نەك (Token) ەكان، لەكاتێكدا كارەكە بەپێچەوانەوەیە و كڕیار لەبەر (Token) ە كان پاكێجەكە دەكڕێت كە پاش ماوەیەك دەبێتە (Coin) وكۆینەكانیش دەڵێن دەبن بە دراو. ئەگینا پاكێجەكان بێ (Token) ە كان

سوودێكی ئەوتۆیان نیە، ئایا هیچ كەسێكی ژیر هەیە ئەو بڕە پارەیە بداتە خولی فێربوونی هەندێك شتی لاوەكی كە هەر ئیشی پێی نیە وسەیریشی ناكات ئەگەر بابەتەكە (**Token**) و (**Coin**) و دراو نەبێت؟!!!.

٨- باشە ئەو دیارییەی كە (**Token**) ە كانە و وای وێنا دەكەن كە شتێكی لاوەكیە ئەگەر ڕاست دەكەن لەمامەڵەكە بیكەنە دەرەوە و تەنها پاكێجەكان بفرۆشن بزانم كێ دەیكڕێت؟!!.

نموونەیەك دێنمەوە بۆ زیاتر تێگەیشتن ئێستا كۆمپانیای فۆرد كاتێك ئۆتۆمبێلێك دەفرۆشێت ژمارەكەی وەكو دیاری دەداتە كەسی كڕیار ئەمە تەواو دروستە چونكە نرخی ژمارەكە بەبەراورد لەگەڵ نرخی ئۆتۆمبێلەكە شایەنی باس نیە، وئەگەر هەر نەیشبێت خەڵكی ئۆتۆمبێلەكان هەر دەكڕن، جا كەستان بینیوە بڵێ من لەبەر ئەوە فۆردم كڕیوە كە ژمارەكەی دیارییە؟.

لەدونیای بازرگانیدا ئەو دیاریانەی لەگەڵ كاڵا بازرگانییەكاندا دەدرێن نرخی دیارییەكان بەبەراورد بەكاڵاكان وبەهاكانیان شایەنی باس نیە، ئەمە تەنها لە سیستەمی (**OneCoin**) دا هەیە كە دیارییەكانی نرخی سەد بەرامبەری نرخی كاڵاكەیە.

من دەقاودەق ئەمەم وەك ئەوە دێتە پێش چاو كە كەسێك بڕوات ئاڵتونێك بكڕێت و پارەی حازری پێنەبێت و بۆ خۆدزینەوە لەوەی كەتووشی سوو نەبێت كابرای زەرەنگەر ئاڵتونەكەی بۆ بخاتە قەباغێكی باغەوە و بڵێ من قەباغێكی باغەم بەو پارەیە پێ فرۆشتویت وئاڵتونەكە دیارییە، ئایا بەم فێڵە ئەم مامەڵەیە حەڵاڵ دەبێت؟! بەدڵنیاییەوە نەخێر.

كەواتە و پاڵپشت بەو خاڵانەی سەرەوە كە باسمان كرد ئەم مامەڵەیە درۆو چاوبەستی تێدایە لەگەڵ بەشداربووان وناڕوونی زۆر لە ئێستا و داهاتووی مامەڵەكەدا هەیە، هەر بۆیە مامەڵە كردن بەم سیستەمە لەم ڕووەیشەوە حەرام و یاساغە.

بەمەیش بۆمان دەركەوت كە بەپێی هەردوو گریمانەكە مامەڵە كردن بە (**OneCoin**)ەوە حەرام و یاساغە.

# تەوەری پێنجەم
# بەڵگەكانی بانگەشەكارانی (OneCoin)

لەم تەوەرەیەدا دەمەوێت تیشك بخەمە سەر ئەو بەناو بەڵگە شەرعییانەی كە بانگەشەكارانی (OneCoin) پشتی پێ دەبەستن بۆ دروستی كارەكەیان، تا گفتوگۆیەكی زانستییان لەبارەوە بكەین:

تاكە بەڵگەیەك كە هەڵسوڕاوانی (OneCoin) پشتیان پێ بەستووە بۆ ڕێگەدان بەمامەڵەكەیان ئەو بنەما فیقهیەیە كە دەڵێت **(الأصل في الأشياء الإباحة)** واتا: هەموو شتێك لەبنەڕەتدا دروستە تا ئەو كاتەی بەڵگەیەكی شەرعی قەدەغەی دەكات. بەلای ئەوانیشەوە مامەڵە كردن بەم دراوەوە شتێكە لەشتەكان وهیچ بەڵگەیەكیش لەبەردەستدا نییە كە یاساغی بكات بۆیە دروستە.

ئەم قسەیەیش بەم شێوەیە دوورە لە ڕاستی و هیچ بنەمایەكی زانستی نییە و بەداخیشەوە زۆر كەس ئەم بنەما شەرعییە نەزانانە بەكار دەهێنن و دەیكەنە گورزێك بۆ شكاندن و تێپەڕاندنی هەموو بەربەستە شەرعییەكان، چونكە ئەم بنەما فیقهییە لێكەوتەی یەكێكە لەسەرچاوەكانی حوكمی شەرعی كە پێی دەگوترێت (الإستصحاب) كە بەواتای بەردەوامبونی حوكمی شەرعی شتەكان دێت كە لە بنەڕەتدا دروستن تا ئەو كاتەی بەڵگەی گۆڕینیان دێت.

ئێستا با كەمێك لەسەر ئەم بنەمایە بدوێین و بزانین قسەكانی ئەوان تاچەند دروستە:

لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا ئەو سەرچاوانەی حوكمی شەرعییان لێ وەردەگیرێت نزیكەی (١٠) سەرچاوەن و بەپێی بەهێزی ولاوازیان ڕیزبەندیان بۆ دەكرێت بەم شێوەیەی لای خوارەوە: (قورئان، سوننەت، كۆدەنگی زانایان، قیاس، إستصحاب، إستحسان، بەرژەوەندیە ڕەهاوكراوەكان، فەرموودەی هاوەڵان، كلتوری كۆمەڵگا، شەریعەتی پێغەمبەرانی پێشتر).

واتا ئێمە كاتێك بە شوێن حوكمی شەرعی بابەتێكدا دەگەڕێین پێویستە لەو سەرچاوانەدا بەشوێنیدا بگەڕێین و بەو ڕیزبەندیەیش كە دیاری كراوە بەتایبەتی لە پێنج سەرچاوەی یەكەمدا، بۆ نموونە دەبێت سەرەتا بزانین حوكمی ئەو شتە لەقورئاندا هەیە،

ئەگەر نەبوو لەسوننەت، ئەگەر نەبوو لە قياس وبەم شێوەيە تا كۆتايى سەرچاوەكان، هەر كاتێكيش حوكمەكەمان لەسەرچاوەيەك دەستكەوت دروست نيە بچين بۆ سەرچاوەى پاش خۆى كە لەو لاوازترە. ئەگەر سەرنجيش بدەين دەبينين (إستصحاب) لەڕيزبەنديدا پێنجەم سەرچاوەيە، پێشەوا خوارزمى لەو بارەيەوە دەڵێت: (وهو آخر مدار الفتوى فإن المفتي إذا سئل عن حادثة يطلب حكمها في الكتاب، ثم في السنة، ثم في الإجماع، ثم في القياس، فإن لم يجده فيأخذ حكمها من استصحاب الحال)[٢٢]. واتا: ئەوە دوايين سەرچاوەى فەتوايە و ئەگەر موفتى دەربارەى ڕووداوێك پرسيارى لێ كرا دەبێت سەرەتا لەقورئاندا بەشوێن حوكمەكەيدا بگەڕێت، دواتر لەسوننەت، دواتر لەكۆدەنگى زانايان، دواتر لەقياس وپێوانەكردنى شتەكان بۆ سەر يەكتر، ئەگەر لەوانە دەستى نەكەوت ئەوكات كار بە ئيستيصحاب دەكات.

هەر بۆيە سەرچاوەى (إستصحاب) بەيەكێك لەسەرچاوە لاوازەكان ئەژمار دەكرێت چونكە لەڕووى ڕيزبەندييەوە پێنجەم سەرچاوەيە و هەندێكيش بەشەشەم سەرچاوە پۆلێنى دەكەن و دەڵێن لەپاش (إستحسان)يش دێت.

جا لێرەدا پرسيارەكە ئەوەيە كە ئايا بەكاربەران وبانگەشەكارانى (**OneCoin**) بەم ڕيزبەندييە بەشوێن بەڵگەى شەرعيبوونى كارەكەياندا گەڕاون؟؟. بەدڵنياييەوە نەخێر؛ چونكە ئێمە وەك پێشتر ڕوونمان كردەوە (**OneCoin**) چ دراو بێت چ كاڵا ئەوە چەندين بەڵگەى حەرامى هەيە لەسەرچاوە بەهێزەكانى وەكو قورئان و سوننەت و قياس و كۆدەنگى زانايان، ئێستا خێرە ئەو بەڕێزانە بەسەر ئەو هەموو سەرچاوانەدا هەنگاو دەنێن بۆ سەرچاوەى پێنجەم و دەڵێن مامەڵە كردن بە (**OneCoin**) وە بە بەڵگەى (الأصل في الأشياء الإباحة) حەڵاڵە؟!!!. بەڕاستى ئەمە هەڵەيەكى زانستى گەورەيە ونابێت بەسەر پسپۆڕانى بوارى شەرعيدا تێپەڕبێت.

ئەمەيش دەقى گفتوگۆيەكى زانستييانەيە لەگەڵ يەكێك لەهەڵسوڕاوان وبەرگريكارانى (**OneCoin**) كە پاش ئەوەى من لە لاپەڕەى خۆم لە فەيسبوك زنجيرە باسێكم لەسەر (**OneCoin**) نووسى، گوايە ئەو بەڕێزەيش لەوەڵامى بەندەدا بابەتێكى لە ڕۆژنامەى ئاوێنە

---

٢٢ – الشوكاني، إرشاد الفحول إلى تحقيق الحق من علم الأصول، ج٢، دار الكتاب العربي، بيروت، ط١٩٩٩، ص١٧٤، تحقيق: الشيخ أحمد عزو عناية.

لەسەر (OneCoin) بڵاوكردۆتەوە، پێم خۆشبوو لێرەدا هەندێك ڕوونكردنەوە لەسەر قسەكانی بدەم و گفتوگۆیەكی زانستییان لەبارەوە بكەم.

بۆ پاراستنی ئەمانەت و ئاستی زانستی بابەتەكەیش من دەقی قسەكانی بەڕێزیان وەك خۆی دەگوازمەوە ودواتر ڕوونكردنەوەیان لەسەر دەدەم.

دیارە جەنابیان بۆچوونیان لەگەڵ بەندە جیاوازە وپێیان وایە كە مامەڵەكردن بە (OneCoin) ە وە هیچ كێشەی نییە و سەرەتا باس لە قسەیەكی ئیمامی غەزالی دەكات كە نابێت مرۆڤ قسە لەبارەی شتێكەوە بكات كەشارەزایی نەبێت و هەر لەو سۆنگەیەوە ئاماژە بەوە دەكات كەخۆی یەكێكە لەبەشداربووانی پڕۆژەی (OneCoin) و لەو بارەیەوە دەڵێت:

(دووەم لەسەر ئەم خاڵەی پێشوو من لەمانگی (٣) ی (٢٠١٧) كە بابەتی (وەن كۆین) م بیست، بۆ ماوەی زیاتر لەمانگێك رۆژانە نزیكەی (٢) كاتژمێر لەسەر ئەم بابەتەم خوێند و ئاگاداری هەر چی خاڵی ئیجابی و سلبی ئەو بابەتە بوم، بەڵام هەستم كرد هێشتا باش لەبابەتەكە تێنەگەیشتوم بەپراكتیكی، بۆیە بەبێ دەنگی ئەكاونتێكم دروستكرد وتم با بزانم دراوی وەن كۆین چۆن دروستدەبێت و لەچی دروستدەبێتو بە چ قۆناغ تێپەر دەبیت...؟؟؟ بۆ ئەوەی بزانم حەڵاڵە یان حەرامە؟ ئەگەر حەڵاڵە چی حەڵاڵە؟ چۆن حەڵاڵە؟ بۆچی حەڵاڵە؟ ئەگەر حەرامیشە چی حەرامە؟ چۆن حەرامە؟ كامە قۆناغ حەرامە؟ لەبەرچی حەرامە؟.

سێیەم: دوای تێپەربوونی زیاتر لە ٥ مانگ بەسەر بەشداریكردنمدا و ئاشنا بونم بەهەمو پرۆسەكانو قۆناغەكانی دروستبوونی (OneCoin).

كەواتە جەنابیان وەك خۆی دانی پێدا دەنێت یەكێكە لەبەشداربوانی پرۆسەكە بۆیە ناكرێت قسەكانی وەك بێلایەنێك وەربگیرێت و ئەوەیش كەدەیلێت سەبارەت بە پاساوی بەشداریكردنی بەمەبەستی شارەزابوون پاساوێكی لاوازە و دەكرا ئەو شارەزاییە بێ بەشداریكردنیش بەدەست بێت؛ چونكە ئەوان سایتی فەرمییان هەیە و چەندین ئەكاونت و پەیجیش هەیە ریكلامیان بۆ دەكات و لێرەیش گروپی كاریان هەیە؛ بۆیە دەكرا لەڕێی ئەوانەوە بەدواداچوون بكات و لێی تێبگات، بەڵام دیارە ئەویش چاوی لەو قازانجە بێ شومارەیە كە بانگەشەكارانی دراوەكە بەڵێنیان پێداوە نەك بەدواداچونی شەرعی.

دواتر بەڕێزیان نەیارانی (OneCoin) بەوە تۆمەتبار دەكات كەزانیارییان لەو بارەیەوە كەمە و بەهەڵە لێی حاڵی بوون ودەڵێت: (هەست دەكەم زانیاری زۆرێك لەو بەرێزانەی كە قسە دەكەن لەسەر (OneCoin) زانیاری زۆر كەمن و هەندێكشی بەو شێوازە نییە كە باسی دەكەن).

من نازانم بۆ دەبێت ڕەخنە گرتن هەمیشە بە ناتێگەیشتن ڕاڤە بكرێت؟! ئەی ئەگەری پێچەوانەكەی لەئارادا نیە؟!.

لە خاڵی دووەم و سێیەمدا ئەوە دووبارە دەكاتەوە كە من پێشتر وەڵامم داوەتەوە و دەمزانی كە بۆ خۆپاراستن لەگرفتە شەرعییەكانی مامەمەڵەكە دەیانەوێت وای وێنا بكەن كە (Token) ە كان شتێكی لاوەكین و خەڵكی بەمەبەستی كڕینی پاكێجەكە بەشداری دەكەن نەك (Token) ە كان و لەو بارەیەوە دەڵێت:

(٢. بەكڕینی پاكێجێكی فێركاری كۆمپانیا ژمارەیەك (توكن Token) بەدیاری پێشكەش دەكات كە دواترو بەچەند پرۆسەیەك دەبن بەدراوێكی ئیلكترونی بەناوی (OneCoin).

٣. كۆمپانیا پلانێكی داناوە بۆ ئەوەی بەهایەك دروست بكات لەبازاردا بۆ ئەو دیارییەی كە وەرتگرتووە (OneCoin) بۆ ئەوەی تۆی كریار وێڕای سوود وەرگرتن لەخولە فێركارییەكان بتوانیت سوود لەدیاریەكەشت وەربگریت).

من پێشتریش ئەم خاڵەم ڕوونكردۆتەوە و گوتومە وێنا كردنی (OneCoin) وەكو كاڵایەك كە بریتیە لە پاكێجێك وئەو پاكێجە هەندێك (Token) ی وەكو دیاری لەگەڵدایە زۆر دوورە لەڕاستییەوە؛ چونكە ئەمە كەسی بەرامبەر وا تێدەگەیەنێت كە كڕیار لەبەر پاكێجەكە خۆی كاڵاكە دەكڕێت نەك (Token) ە كان، لەكاتێكدا كارەكە بەپێچەوانەوەیە كڕیار لەبەر (Token) ە كان كاڵاكە دەكڕێت كە پاش ماوەیەك دەبێتە (OneCoin) وئەوانیش دەڵێن دەبنە دراو. ئەگینا وەك پێشتریش باسمان كرد پاكێجەكان بێ (Token) ە كان سوودێكی ئەوتۆیان نییە. باشە ئەگەر ڕاست دەكەن و (Token) ە كان شتێكی لاوەكین ئادەی لەمامەڵەكە بیكەنە دەرەوە و تەنها پاكێجەكان بفرۆشن بزانین كەس بەو پارە خەیاڵییە دەیانكڕێت؟!!.

دواتر ئەو بەڕێزە خۆیشی ناتوانێت تاسەر لەسەر وێناكردنی پێشووی بۆ (OneCoin) وەك پاكێجێكی فێركاری یاخود كالآیەك بەردەوام بێت و لەخاڵی (٤- ٥) ی نووسینەكەیدا دان بەو ڕاستییەدا دەنێت كە (OneCoin) دراوە و باسی بازاڕێك دەكات كە دەتوانیت بە (OneCoin) مامەڵەی تێدا بكەیت، و دواتریش باس لەپلانی چوونی (OneCoin) بۆ ناو بۆرسە جیهانییەكان دەكات ودەڵێت:

(٤. بۆیە كومپانیا هەڵساوە بەدروستكردنی بازارێكی ئەلكترۆنی بەناوی (DealShaker) كە كالآی جۆراوجۆری تیایە بە (OneCoin) دەفرۆشرێت.. ئەم بازاڕە لەمانگی ٣ی ٢٠١٧ كەوتوتە ئیش و ڕۆژانە كڕین و فرۆشتنی تێدا دەكرێت هاوشێوەی بازاڕەكانی (ئەمازۆن – عەلی بابا و...). بۆ زیاتر ئاشنابوون سەردانی ئەم سایتە بكە: https://www.dealshaker.com/en.

٥. سەرەرای ئەو بازارە كە مامەڵە بە (OneCoin) دەكات كۆمپانیا پلانی داناوە بۆ ئەوەی دراوی (OneCoin) لە ٨/١٠/ ٢٠١٨ بچێتە ناو بۆرصە جیهانییەكان و كۆینەكان عەرز بكات بۆ فرۆشتن. ئەم پرۆسەیە پێی دەوترێت (ICO) و یەكەم هەنگاوی ئەم قۆناغە لە ١٥/١٠/٢٠١٧ دەستپێدەكات واتە: لەچەند رۆژی داهاتوودا.. https://www.onecoinico.io.....).

من لەگەڵ ئەوەی كە تێبینی زۆرم هەیە لەسەر ئەو بازاڕەی باسی دەكات (DealShaker) لەڕووی جۆری كالآ ونرخەكانی بەرامبەر بەبازاڕ و ئەو كۆمپانیایانەی تێیدا بەشدارن و ئامادەن بە (OneCoin) بكڕن وبفرۆشن، كەلێرەشدا دیسان فێڵ و چاوبەستێكی زۆر لە بەشداربووان دەكرێت، بەڵام ئەوە باسێكی ترە و زۆر سەری خۆمانی پێوە نایەشێنین، گرنگ ئەوەیە  لێرەدا نووسەر ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت كە ئێمە دەڵێین (OneCoin) لەبنەڕەتدا دراوە و بۆ ئەو مەبەستەیش هاتۆتە بوون و ناساندنی وەك پاكێجێكی فێركاری تەنها بۆ فریودانی خەڵك و خۆدزینەوەیە لە پرسی شەرع و بەرپرسیارێتی بەرامبەر یاسا.

پاشان نووسەر دێتە سەر باسی پوختەی ئیشەكە و باس لەسوودەكانی پاكێجەكانی (OneCoin) بەگشتی دەكات و دەڵێت: (كەواتە پوختەی ئیشەكە تا ئێستا ئەمەیە: بەكڕینی

پاكێجێك ئەم سودانەت دەست دەكەوێت: فێری بزنس، كاری بازرگانی، بازرگانی سەدەی ٢١، بازرگانی ئەلكترۆنی، دراوی ئەلكترۆنی دەبیت، بەشێوەیەكی ئەكادیمیو سەردەمییانە، بەتەواوكردنی خولەكە تێستێك دەكەیت و بڕوانامە وەردەگریت).

لێرەدا پێم خۆشە هەڵوێستەیەك بكەین و بپرسین باشە هەموو ئەوانەی سەرەوە كە باسكراون بۆ (Token) ەكان دەبێت نرخیان چەند بێت؟. هیچ كەسێكی ژیر ئەگەر كورد واتەنی (پارەی لەپێستی گادا بێت) شەش دەفتەر دۆلار دەدات بەو شتانە، كە نرخی هەندێك لەپاكێجەكان ئێستا ئەوەندەیە.

دواتر دەچێتەوە سەر هەمان باسی پێشوو زۆر بەلاوەكی ولەپەراوێزدا باسی (Token) ەكان دەكات كە دەبنە (Coin) ودەڵێت: جگە لە فێربوون وبڕوانامە دەبیتە خاوەن چەند كۆینێك (بەپێی قەبارەی پاكێجەكەت). ئەم كۆینانە لە ئێستادا دەتوانیت:

١- كاڵای پێ بكڕیت لەبازاری (DealShaker).

٢- (OFC) پێ بكڕیت كە دواتر دەبنە پشكی كۆمپانیا.

٣- بیخەیتە صندۆقی وەبەرهێنان لای كۆمپانیا خۆی لە بەشی (Coinsafe) كە دەتوانیت بەپێی ئەحكامی شەریعەتی ئیسلامی وەبەرهێنان بكەیت. (دوای چوونە بۆرصەشەوە دەتوانیت كۆینەكانت بفرۆشیتەوە).

لەڕاستیدا ئەم وێناكردنە پێچەوانەكەی ڕاستە و (Coin) ەكان مەبەستی سەرەكی مامەڵەكەن، ولێرەشدا دیسان دان بەوەدا دەنێت كە (Coin) ەكان دراون و لەهەموو ئەوانەیش سەیرتر ئەوەیە كە دەڵێت: (دەتوانیت بەپێی ئەحكامی شەریعەتی ئیسلامی وەبەرهێنان بكەیت). ئەوە ڕێك وەكو ئەوەم دێتە پێش چاو بەكەسێك بڵێیت: ئەو بەرازە بكڕە ودواتر دەتوانیت بەپێی شەریعەی ئیسلامی سەری بڕیت، ئاخر كاكی من بەراز خۆی حەرامە چۆن بەسەربڕین حەڵاڵ دەبێت، ئێمەیش دەڵێین ئەصلی مامەڵەكە حەرامە دواتر چۆن بەحەڵاڵی بەكاردێت.

لە خاڵی (٨) دا دیسان پێ لەو ڕاستییە دەنێتەوە كە (OneCoin) دراوە و دەڵێت: (لەروی تەكنەلۆژیاوە كۆمپانیا تەكنەلۆژیای (Blockchain) بەكار دێنێت كە تازەترین و

بەهێزترین تەكنەلۆژیای جیهانە بۆ پاراستن و سیكیوریتی ومامەڵەو حەواڵەكردنی دراو...ئیستا زۆرێك لە وڵاتە پێشكەوتووەكان بڕیاریان داوە ئەو تەكنەلۆژیایە بەكاربێنن).

لەخاڵی (٩) دا باس لەڕێ وشوێنە یاساییەكان دەكات كە كۆمپانیا دەیگرێتە بەر بۆ ڕێگە گرتن لەخراپ بەكارهێنانی ئەم جۆرە دراوانە و دەڵێت: (لەڕووی یاسایی وشەفافیەتەوە (OneCoin) تاكە (CryptoCurrency)ە كە ئیش بە سیستمی (KYC) دەكات، ئەویش بریتییە لە ناسینی هەموو بەشداربویەك، واتە زانیاریەكانی هەموو بەشداربووان وەك ناو و پاسپۆرت و نیشتەجێبوون و... لەلایەن كۆمپانیاوە هەیە، ئەمەش بۆ ئەوەیە كە هیچ مامەڵەیەكی نایاساییو خراپ بە (OneCoin) نەكرێت).

ئەم قسەیە ڕاستە وكارێكی زۆریش باشە بەڵام ئەم جۆرە سیستەمە لەگەڵ سرووشتی دراوی ئەلكترۆنی یەك ناكاتەوە، هەر بۆیە تا ئێستا (OneCoin) لەنێوان ئەو دراوە ژمارەییانەدا بوونی نییە كە لە پێگەی (Coin Market Cap) تۆمار كراون كە پێگەیەكی تایبەتە بەبەدواچونی كار وبەهاكانی دراوە ئەلكترۆنییەكان. هەر ئەو سیستەمەیش كاریگەری زۆر خراپ لەسەر داهاتی (OneCoin) دروست دەكات؛ چونكە ئەوان ئێستا چاویان لەسەر (Bitcoin) وقازانجە زەبەلاحەكانێتی و بەوەیش هەواداران و بەشداربووانی خۆیان فریو دەدەن، لەكاتێكدا هەموومان دەزانین كە هۆكاری بەرزبوونەوەی بەهای (Bitcoin) بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە دوور لەچاوی یاسا و هەر چاودێرییەكی دارایی لەلایەن هاكەرز و بازرگانی بەمادە هۆشبەرەكان و سپی كردنەوەی پارە و تۆڕەكانی لەشفرۆشی و باندەكانی تیرۆرەوە مامەڵەی پێوە دەكرێت. بۆیە گرنگە ئەوان ڕاستییەكان وەكو خۆی بۆ خەڵكی باس بكەن و بە بەها و قازانجی (Bitcoin) بەشداربووەكانیان فریو نەدەن.

دواتر ئەو بەڕێزە كۆمەڵێك خاڵ تێكەڵ بەیەك دەكات و كۆمەڵێك پرسیار دەوروژێنێت و دەڵێت: (دوای ئەم خاڵانەی سەرەوە كە پوختەی ئیش و كاركردنی وەن كۆین دەریدەخات جێی خۆیەتی پرسیار بكەین:

- ئایا كام خاڵ لەو خاڵانەی سەرەوە حەرامە؟!.
- كام قۆناغ لە قۆناغەكانی ئەم جۆرە كاركردنە حەرامە؟!.
- ئایا بەشداریكردن لە خولێكی فێركاری ئەلیكترونی حەرامە؟؟؟!.

- ئایا وەرگرتنی دیاری لەگەڵ بەشداریكردن لە خولێكی فێركاری حەرامە؟!.
- ئایا ئەگەر دیارییەكت وەرگرت و دواتر ئەو دیارییە بەهایەكی كرد لە بازاڕداو بۆ بە دراو، ئایا فرۆشتنی ئەو دراوە حەرامە؟!.
- ئایا كاتێك تۆكنەكانت هەموو پرۆسەكانی بوون بە دراو تەواو دەكەن و دەبن بە (OneCoin)حەرامە ئەم كۆینانە بەكاربێنیت بۆ كڕینی شت لەو بازاڕانەی كە مامەڵە بەو دراوە دەكەن؟!.
- ئایا تەكنەلۆژیای بلۆك چەین حەرامە؟؟!.
- ئایا سیستمی (KYC) حەرامە؟؟!).

ئاخر ئەم قسە وپرسیارانە بەو سادەییە نین كەجەنابت دەتەوێت وێنای بكەیت و بەسەرپێی بەسەریاندا گوزەر بكەیت، كەس نەیگوتوە خولی فێركاری ئەلكترۆنی حەرامە، كەسیش نەیگوتوە وەرگرتنی دیاری حەرامە. بەس ئەمە چەواشەكردنی خوێنەرە چونكە (Token) ە كان وەكو پێشتریش گوتم دیاری نین بەڵكو كرۆكی مامەڵەكەن و لەبنەڕەتدا كڕین وفرۆشتنەكە بەوانەوە دەكرێت و من تەحەددا دەكەم یەك كەس ئەو پاكێجانەی ئێوەی بوویێت بەو نرخانە بێ (Token) ەكان!!.

یان كە دەپرسیت: (ئایا ئەگەر دیارییەكت وەرگرت و دواتر ئەو دیارییە بەهایەكی كرد لە بازارداو بۆ بە دراو ئایا فرۆشتنی ئەو دراوە حەرامە؟).

لێرەدا خودی پرسیارەكە هەڵەیە چونكە لەگەڵ سروشتی مامەڵەكەی بەڕێزتان یەك ناكاتەوە تۆ ئەگەر بتەوێت ڕاستییەكان وەك خۆی ڕوون بكەیتەوە دەبێت بپرسیت: (ئەگەر دراوێكت كڕی كە ئێستا بوونی نیە و دواتر ئەو دراوە بو بە دراوی ڕاستەقینە وبەهایەكی كرد لە بازاردا، ئایا فرۆشتنی ئەو دراوە حەرامە). بەڵێ حەرامە وجەنابیشت زۆر لەمن باشتر ئەوە دەزانیت ودەشزانیت كە گۆڕینی ناوی (دراو) بە (دیاری) حوكمی شەرعی ناگۆڕێت.

دواتریش دەپرسیت: (ئایا كاتێك تۆكنەكانت هەموو پرۆسەكانی بوون بە دراو تەواو دەكەن و دەبن بە (OneCoin) حەرامە ئەم كۆینانە بەكاربێنی بۆ كڕینی شت لەو بازاڕانەی كە مامەڵە بەو دراوە دەكەن؟).

**من پێت دەڵێم: فرۆشتنی (Token) ەكان لە ئێستادا شتێكە و دواتر كە بوون بەدراو و (Coin) شتێكی ترە و ئەو كات مامەڵەكردن پێوەی قسەیەكی تر هەڵدەگرێت، خۆ ناشكرێت ئێمە ئەم قۆناغ بەندی وجیاوازی كاتە فەرامۆش بكەین بڵێین جا جیاوازیان چییە، من نموونەیەكتان عەرز دەكەم كەسێك پارەییەكی زۆری هەیە لەماڵەوە دەچێت لەبازاڕ دراوێكی تر بكڕێت بەڵام ئێستا پارەكەی ئامادە نییە ئایا ئەم مامەڵەیە حەلاڵە؟!. بەدڵنیاییەوە نەخێر بەڵكو دەبێت پارەكەی ئامادە بێت یان چەكێكی بانكی بەبڕی پارەكە ڕادەستی كابرا بكات، ئەمە لەكاتێكدا ئێمە دڵنیایین لەبوونی پارەكە و لەوانەیشە ئەگەر بمانەوێت لەچەند خولەكێكدا ئامادەی بكەین، بەڵام قسەی شەرع لەسەر مامەڵەكە بۆ ئێستایە، جا وەرە ئەوە بەراورد بكە بەو كارەی بەڕێزتان ئێستا دەیكەن، ئێوە كە (Token) ەكان دەفرۆشن (OneCoin) ەكان هەر بوونیان نیە، دواتر ئەمانە پاش ماوەیەك دەبنە (OneCoin) كەسیش نازانێت چەند (Coin) دەكەن، وە ئێوە خۆیشتان نازانن و ناشتوانن گرەنتی ئەوە بدەنە كەس كە (OneCoin) لەداهاتوودا دەبێتە دراو و دەچێتە بۆرسە یان نا، بۆیە لە ئێستادا ناچارن وەك پاكێجی فێركاری مامەڵەی پێوە بكەن.**

**من پێم خۆشە ئەو ڕیسك ومەترسیانەیشت لەنووسینەكەتدا باس بكردایە و ئاوها بەسادەیی ئەو پرسیارانەت نەكردایە.**

**بەداخەوە جارێكی تر و بۆ دیزە بەدەرخۆنەكردنی هاوكێشەكان دەپرسیت: (ئایا تەكنەلۆژیای بلۆك چەین حەرامە؟! ئایا سیستمی (KYC) حەرامە؟؟!). نەخێر ئەمانە هیچیان حەرام نین وبگرە زۆریش باشن و كەسیش قسەی لەسەر ئەوانە نییە.**

**دواتر بەسەرسوڕمانەوە دەپرسیت: (چی حەرامە؟! و كام بڕگە حەرامە؟! و بۆچی حەرامە؟! و بە چ بەڵگەیەك حەرامە؟!).**

**كورد واتەنی گوتیان: حوشتر ملت خوارە. گوتی: جا كوێم ڕاستە تا ملم خوار بێت. یان وەكو شاعیر دەڵێت:**

**وهل يصح فی الأذهان شيء إذا احتاج النهار إلى دليل.**

**جا منیش نازانم (OneCoin) كوێی حەلاڵە تا قسە لەسەر حەرامییەكەی بكرێت.**

پاشان دێيتە سەر باسكردنى جۆرى حەرامەكان كە دەبن بەدوو بەشەوە ودەپرسيت حەرامى (OneCoin) كام جۆرە حەرامەيانە ودەڵێيت: (پرسيارەكە لێرە ئەمەيە: ئەگەر (OneCoin) حەرام بێت كام جۆرەيە؟ ئايا (محرم لذاته) يە؟ يان (محرم لغيره)؟ ).

ئەگەر دەتەوێت وەڵامەكەى بزانيت من خزمەتت دەكەم ودەڵێم مامەڵە كردن بە (OneCoin) ە وە بەم شێوازەى ئێستاى لەجۆرى يەكەميانە و (محرم لذاته) يە.

دواتر دەپرسيت: (ئەگەر جۆرى يەكەمە، كام شتەى وەن كۆين حەرامە؟! ئايا لە پێكهاتەيەكى نەجس دروست بووە وەكو خوێن و گۆشتى بەراز؟ ئايا سەرخۆشت دەكات وەكو عەرەق؟!).

نا كاكە تۆ بۆ ئەوەندە دوور دەڕۆيت و بابەتە فيقهييەكان تێكەڵ دەكەيت، ئەو نموونانەى تۆ باست كردون لەفيقهى ئيسلاميدا لەبابەتى خواردەمەنييە حەرامكراوەكاندا باس كراون، ئەوەيش ئێمە گفتوگۆى لەسەر دەكەين و جەنابت لەبارەيەوە دەپرسيت لەبابەتى مامەڵە دارايى و بازرگانييەكانە، بۆيە حەرامى (OneCoin) لەهاوشێوەى حەرامبوونى سوو، قومار، چاوبەست كردنە، و هەموو ئەوانەيش لە بابەتى مامەڵە بازرگانييەكاندا (محرم لذاته) ين وەك خوێن و گۆشتى بەراز لە بابەتى خواردەمەنييە حەرامكراوەكاندا.

پاشان پێش خوێنەر دەكەويت و بەر لەوەى وەڵامت بداتەوە بيرى پەرت دەكەيت و خۆت وەڵامى خۆت دەدەيتەوە و دەڵێيت: (بەدڵنيايەوە دەتوانم بڵێم (OneCoin) لەم جۆرە حەرامە نييە، چونكە دراوێكى ئەلكترۆنيەو بەسيستمێكى تەكنەلۆژى پێشكەوتوو دروست دەكرێت).

باشە ئێستا خۆت بەڕوونى و ڕاشكاوانە دانت بەوەدانا كە (OneCoin) دراوە نەك پاكێجى فێركارى، كەواتە وەك پێشتريش گوتمان دەبێت هەموو مەرجەكانى مامەڵەكردن بەدراوى شەرعى تێدابێت ئەوجا دروستە مامەڵەى پێوە بكرێت، وەك ئەوەى لەئێستادا دراوێكى فەرمى بێت و نرخ و ڕەگەزى دياريكراوى هەبێت و هەبووى ڕاستەقينە يان حوكمى هەبێت لەكاتى گۆڕينەوەيدا بەدراوێكى تر، كە چى تۆ باس لەهيچ كام لەم مەرجانە ناكەيت و خۆتى لێ دەدزيتەوە و لەبرى ئەوانە باسى دوو شتى تر دەكەيت كە هيچيان خاڵى يەكلاكەرەوە و بنەماى حوكمى شەرعى نين بۆ مامەڵەكردن بە دراوەوە. ئەوانيش (ئەلكترۆنى

بوون و بەسیستەمی پێشكەوتوو بەرهەم هاتنە) ڕوونتر بڵێم بەلای بەرێزتانەوە: هەر دراوێك ئەلكترۆنی بوو، وە بەسیستەمی تەكنەلۆژی پێشكەوتوو دروست كرابوو ئیتر حەڵاڵە مامەڵەی پێوە بكرێت؟!. ئەوانە هەرگیز نابنە پێوەر، ئەگەریش هەر پێت وایە خۆ ئێستا (Bitcoin) یش ئەو دوو مەرجەی تێدایە، حەز دەكەم ڕای جەنابتی لەبارەیەوە بزانم؟.

بەردەوام دەبێت لەسەر فەرزكردنی ئەگەرەكان ودەڵێیت: ( ئایا (OneCoin) لە جۆری دووەمە لەحەرام واتە (محرم لغیره)؟ ئەگەر خۆی لەخۆیدا حەرام نەبێت، ئایا ئەم مامەڵەیە بە چ هۆكارێكی دەرەكی حەرام دەبێت؟). ئێستا من بۆم ڕوونكردیتەوە كە حەرامییەكەی لەجۆری یەكەمە بۆیە ئەم گریمانەیە بەلای منەوە بەتاڵە.

دواتر دێیتە سەر بەڵگە هێنانەوە بۆ شەرعیەتی (OneCoin) ودەڵێیت: (قاعیدەیەكی أصولی دەڵێت (الأصل في الأشياء الإباحة) واتە: لەبنەڕەتدا هەموو شتێك حەڵاڵە، بەتایبەتی لە (معاملات) دا، واتە هەموو مامەڵەیەك حەڵاڵە مەگەر هۆكارێكی تر بكەوێتە ناوەوە وەك (غەش – درۆ – دزی – فێڵ – ریبا).

من پێشتر وەڵامی ئەم قسەیەم بەووردی داوەتەوە بۆیە لێرەدا دووبارەی ناكەمەوە.

جارێكی تر دەكەویتەوە پرسیار كردن ودەڵێیت: (دووبارە پرسیار دەكەین كام لەم هۆكارانە بەدی دەكرێت لەمامەڵەكردن بە(OneCoin) ؟ ئایا كۆمپانیا لەماوەی ٣ ساڵی ئیشكردنی چ غەشێكی كردووە لە بەشداربووانی كە زیاتر لە ٣ ملیۆن بەشداربووی هەیە؟!.. كۆمپانیا چ درۆیەكی كردووە لەگەڵیان؟! دزی لەكام بەشداربوو كراوە؟! فێڵ لەكێ كراوە؟!، كام بڕگە لەئیشكردن ریبای تێكەوتووە؟! كام بەشداربووی وەن كۆین زەرەری كردووە؟! كامیان پەشیمانە لە بەشداریكردن؟!).

من پێت دەڵێم كۆمپانیا چ غەش وفێڵێك دەكات، كۆمپانیا فریوی ئەندامانی دەدا بەقازانج و دەستكەوتی خەیاڵی و جەنابیشتان لەمن بە ئاگاترن كە خەڵكی ئێوە لەسیمینارەكاندا چی بەئامادەبووان دەڵێن و چۆن حاڵییان دەكەن كەلەماوەیەكی زۆر كەمدا دەبنە ملیۆنێر وملیاردێر بە بێ ئەوەی باسی ڕیسك وئەگەرە نەخوازراوەكانی تر بكەن، كۆمپانیا بەخەڵكی دەڵێت كەوا دەتوانن مامەڵە بەپارەكانیانەوە بكەن و چیان بوێت پێی بكەن. كە ئەمە تائێستایش دوورە لەڕاستییەوە.

دەڵێیت: (كێ پەشیمانە، وكێ زەرەری كردوە؟). ئەمانە كەی پێوەری حەرامی وحەڵاڵی مامەڵە شەرعیەكانن تا بكرێنە پرسیار، ئەو كەسانەی كە سووخۆرن یان فێڵبازن یان دزن هیچ كات پەشیمان نین و بەدەگمەنیش نەبێت زەرەر ناكەن بەڵام خۆ ناكرێت بڵێین بەخاتری ئەوەی زەرەر ناكەن و پەشیمان نین ئیتر كارەكەیان دروستە.

سەبارەت بە سوویش لەسەرەوە عەرزم كردویت كە چۆن و بەچ شێوەیەك سووی تێ دەكەوێت و جۆری سووەكەیش چییە و چۆنە و بەڵگەكانیشیم خستۆتە ڕوو.

لەكۆتاییدا دەپرسیت: (كام دەقی صحیح و صریح هەیە كە ئەم جۆرە مامەڵەیە قەدەغە بكات؟!).

من هەموو قسەكانم بەبەڵگەوە خستۆتە ڕوو بەڵام بەداخەوە تۆ بۆ پشتگیری قسەكانت یەك بەڵگەیشت نەخستۆتە ڕوو، ئەوەی باستان كردووە زادەی بیری بازرگانی و بەرژەوەندی بەرتەسكی خۆتانە و هیچی تر.

لەهەموو قسەكانی سەرەوەت سەیروسەمەرە تر بڕگەی كۆتایی ڕوونكردنەوەكەتە كەدەڵێیت: (لەكۆتاییدا دەڵێم زۆر ئاساییە خەڵكێك گومانی هەبێت لەسەر ئەم دراوە و هەر بابەتێكی تر، یان ترسی هەبێت لێی یان ڕەخنەی هەبێت یان متمانەی پێی نەبێت یان.. بەڵام حەقوایە ئەم ڕاوبۆچوون و سەرنج و ڕەخنانە نەخرێتە بەرگی شەرعی ئیسلامەوە، یان قاڵبی حەڵاڵو حەرامەوە...).

بەڕێز من تێناگەم مەبەستت چییە كە دەڵێیت: (حەق وایە ئەم ڕاوبۆچوون و سەرنج و ڕەخنانە نەخرێتە بەرگی شەرعی ئیسلامەوە، یان قاڵبی حەڵاڵ و حەرامەوە). ئەی ئەگەر نەیخەینە بەرگی شەریعەتی ئیسلامەوە بەچ شەریعەتێك پێودانگی بكەین؟! بەتەورات یان ئینجیل یان عەقڵ و ئارەزووە؟!. ئەی ئەگەر نەیخەینە قاڵبی حەڵاڵ وحەرامەوە، بە چ قاڵبێكی تر مەزەنەی بكەین و هیچ كردەوەیەكی مرۆڤ هەیە نەچێتە ئەو قاڵبەوە؟! بۆ زانایانی (أصول) كردەوەكانی مرۆڤ دابەش ناكەن بەسەر (واجب، حرام، مندوب، مكروە، مباح)؟!.

بۆ هیچ كردەوەیەك هەیە لەم پێنج بەشە بەدەر بێت؟! ئەی ئەگەر ئێمە مامەڵە داراییەكانمان لەحەڵاڵ و حەرام دەركرد، بەچ پێوەرێكی تر هەڵسەنگاندنیان بۆ بكەین.

لەكۆتاییشدا ئەگەر ئەم قسانەت بەجدییە و سوعبەت ناكەیت ئەی ئەم ڕوونكردنەوەیەی بەڕێزت لەسەر چییە، ئەی ئەوە نییە بەڕێزت نووسیوتە: (گفتوگۆیەكی هێمنانە لەسەر لایەنی شەرعی (وەن كۆین)..). ئەوە نییە دەتەوێت بەرگی حەڵاڵی بكەیت بەبەردا. یان ڕاشكاوانەتر بڵێ كەس نەڵێ حەرامە، ئاوا قسەكە لای من و سەرجەم خوێنەرانیش ڕوونتر دەبوو بەڵام ئێستا و بەم شێوەیە ببورە زۆر ئاڵۆزە.

لەدوا داواكاریشتدا پاساو بۆ قسەكانت دێنیتەوە ودەڵێیت: (چونكە ئەگەر ئیشەكە خوا نەخواستە لەبنەڕەتدا حەرام بێتو تۆ فەتوای حەڵاڵبوونت دا ئەوا خەڵكانێكی زۆر بەهۆی فەتواكەی تۆ تووشی حەرام دەبن. ئەگەر شتەكە حەڵاڵ بێت تۆ فەتوای حەرامبونیتدا ئەوا خەڵكانێكی زۆر بێبەش دەكەیت لەو خێرە).

باشە بەڕێزەكەم تۆ كە بڕوات وایە و ئەو عەرەبییە فەصیحە دەزانیت ئەی بۆ لەسەرتاوە فەتوای حەڵاڵبوونیت داوە و بەرگری لێدەكەیت و سەدەها كەس بەهۆی قسەی ئێوەوە تێوەگلاون، ئەی بۆ ئەوكات هەڵوێستەتان نەكرد وخەمی خەڵكتان نەبوو.

باشە ئەو كات گوزەراو گریمان نەتانزانی ئەی ئێستا و پاش ئەم ڕوونكردنەوانەی ئێمە هەر نازانن؟!.

ئەوەتا دكتۆر عەلی قەرەداغیش داواتان لێدەكات ڕایگرن بۆ ڕایناگرن[٢٣]، ئەی باشە قسەی ئێمەو مانان وجەنابی دكتۆر هەر هیچ نەبێت گومانێك لەسەر شەرعییەتی ئەو كارە دروست ناكات؟. ئەی پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەر بێت) بۆ ئەم جۆرە كارو كایانە نافەرموویێت: (فمَن اتَّقى الشُّبهات فقد استبرأ لدينه وعرضه، ومَن وقع في الشُّبهات وقع في الحرام،)[٢٤].

---

٢٣- تێبینی: ئەم بابەتە لەبەرواری (٢٠١٧/١٠/٤) نووسیومە و لەپەڕەی تایبەتی خۆم لە فەیسبووك بڵاوم كردۆتەوە و ئەوەی ئاماژەم پێكردووە بڕیاری دكتۆر عەلی قەرەداغی بوو لەو كاتەدا، پاشتر دكتۆر عەلی لەبەرواری (٢٠١٨/٨/١٩) وپاش زیاتر لە (١٠) مانگ لەبڵاو كردنەوەی ئەو بابەتە فەتوای حەرامی مامەڵەكردنی بە (OneCoin) ە وە دەركرد.

٢٤ - البخاري، صحيح البخاري، ج١، ص٢٠.

واتا: هەر كەس خۆی لەشتی گوماناوی پاراست ئەوە دین وداوێن وناموسی پاك ڕاگرتوە وهەركەسیش كەوتە شتی گوماناویەوە ئەوە كەوتۆتە حەرامەوە[٢٥].

پرۆفیسۆر
خالد محمد صالح
٢٠١٧/١٠/٤

## تەوەری شەشەم:
## بۆچوونی زانایان لەسەر مامەڵەكردن بە (OneCoin) ە وە

پاش ماوەیەك و بە مەبەستی یەكلاكردنەوەی ئەو پرسە و زیاتر دڵنیاكردنی هەموو لایەك لە حەرامی مامەڵەكردن بەو دراوەوە لە (٢٠١٨/١/٦) نووسراوێكم ئاراستەی لیژنەی باڵای فەتوای هەرێمی سەر بەیەكێتی زانایان كرد وتوێژینەوە زانستییەكەی خۆم لەگەڵ هاوپێچ كرد و داوای بۆچوونی بەڕێزیانم لەسەر بابەتەكە كرد كە ئەمە دەقەكەیەتی:

**بسم الله الرحمن الرحيم**

**الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على أشرف الأنبياء والمرسلين سيدنا محمد ﷺ وعلى آله وصحبه أجمعين.**

مامۆستایانی بەڕێزی ئەندامانی لیژنەی باڵای فەتوای هەرێمی كوردستان:

---

٢٥ - ئەی ئێستا دەكرێت بپرسین كوا ئەو هەموو بەڵێنەی خەڵكتان پێ هەڵخەڵەتاند كە ئەم دراوە دەچێتە بۆرسە جیهانییەكانەوە و بەهاكەی دەفڕێت و قازانجی خەیاڵییان دەست دەكەوێت، ئەوە زیاتر لەساڵێك بەسەر بەڵێنەكانتان تێپەڕ بوو نەك هەر نەچووە هیچ بۆرسەیەك بەڵكو ئێستا ئەندازیاری بیرۆكەكە لە زیندانە و بەتۆمەتی درۆ و هەڵخەڵەتاندنی خەڵك و سپیكردنەوەی پارە و چەندین تۆمەتی تر دادگایی دەكرێت، ئێستا دەكرێت پێمان بڵێن ئێوە چی وەڵامی ئەو خەڵكە دەدەنەوە كە لەخشتەتان بردوون و پارەكانتان بە ناحەق خواردوون؟!.

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

بەڕێزان وەك جەنابتان ئاگادارن ماوەیەکە دەنگۆی بەکارهێنانی دراوی ئەلکترۆنی بەناو هەرێمەکەماندا بڵاو بۆتەوە وخەڵکانێکی زۆر لەچینوتوێژە جیاوازەکان پێوەی سەرقاڵبوون، بیرۆکەی ئەم جۆرە دراوانەیش تازەیە و پێویستی بە بەدواداچوون و لێکۆڵینەوەی جدی هەیە بۆ ڕوونکردنەوەی حوکمە شەرعییەکەی، هەرچەندە ئەم جۆرە دراوانە ئێستا زیاتر لە (٧٠٠) جۆری هەیە بەڵام گرنگترینیان وئەوەی ئێستا لەکوردستان بازاڕی گەرمە دراوی گریمانەیی (OneCoin) ە، کەماوەیەکە خەڵکی بەزۆری سەریان تێکردوە و مامەڵەی پێوە دەکەن، هەرچەندە لەئێستادا نەبوەتە دراو و نەچۆتە هیچ بۆرصەیەکی جیهانییەوە بەڵام بەکاربەرانی بەڵێنی ئەوە بەبەشداربووانی دەدەن کە لەداهاتوویەکی نزیکدا بەفەرمی دەبێتە دراو و دەچێتە بۆرصەوە.

ئەم جۆرە مامەڵەیەیش مەترسی زۆر لەسەر ماف و دارایی بەشداربووانی بەتایبەت و لەسەر ئابووری هەرێم بەگشتی دروست دەکات، لەبەرامبەریشدا ئەگەر دروست بێت ئەگەری قازانجی زۆری هەیە.

هەرچەندە من بۆ خۆم و لەقەدەر توانای سادەی خۆم بەدواداچوونم بۆ کردوە و بۆچوونی تایبەتی خۆم لەسەر داوە و لەتوێژینەوەیەکدا کە هاوپێچی ئەم داواکاریەیە دەیخەمە خزمەتتان، بەڵام بەدڵنیاییەوە بۆچونی جەنابتان سەنگ و قورسایی تایبەتی خۆی هەیە، بۆیە داواکارین لەبەڕێزتان بفەرموون وبەدواداچوونی جدی بۆ ئەم دراوە وهاوشێوەکانی بکەن و بڕیاری خۆتانی لەسەر بدەن تا چیتر خەڵکی لە دڵەڕاوکێدا نەمێننەوە.

هەر ئاسانکاری وهاوکاریەکیش لەوبارەیەوە بە ئێمە بکرێت لەخزمەتین.

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته.

براتان

پ. د. خالد محمد صالح

٢٠١٨/١/٦

پاش نزیکەی سێ مانگ لەبەدواداچوون و لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لەسەر بابەتەکە لیژنەی باڵای فەتوای هەرێم بە سوپاسەوە لەبەرواری (٢٠١٨/٤/٥) وەڵامی پرسیارەکەیان دایەوە و بڕیاری حەرامی مامەڵەکردنی بەدراوی (OneCoin) ە وە دەرکرد لەفەتوایەکدا کە ئەمە دەقەکەیەتی:

## حوکمی مامەڵەکردن و بازرگانیکردن بە دراوی (Onecoin) وە

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَاسْأَلُواْ أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ﴾[٢٦].

سوپاس‌و ستایش بۆ خوای جیهانیان، درودو سڵاو لەبەڕێزترین پێغەمبەر و لەسەر خانەوادەی و یارانی‌و پەیڕەوانی ئەو بەچاکە تا ڕۆژی قیامەت.

لیژنەی باڵای فەتوا لە هەرێمی کوردستان لە دانیشتنی ئاسایی خۆی لەڕۆژی پێنج شەممە بەرواری (٢٠١٨/٥/٤) لە بارەگای سەرەکی خۆی لە شاری هەولێر تیشکی خستە سەر بابەتی مامەڵە کردن بە دراوی ئەلیکترۆنی (Onecoin) پاش ئەوەی کە پرسیاری ئاراستە کرابوو لەلایەن هەندێك هاوڵاتیانی بەڕێزی کوردستانەوە بە تایبەت بەڕێز (پ. د. خالید محمد صالح) سەرۆکی ئیستتیوتی ژیار بۆ پەروەردەو گەشەپێدانی مرۆیی کە لە بەرواری (٢٠١٨/١/٦) بە نوسراوێکی فەرمی لە ڕێگەی ئیمەیڵەوە.

لیژنەکەمان پاش لێکۆڵینەوەی پێویست و تاوتوێ کردنی بە کۆی دەنگ ئەم فەتوایەی لەو ڕوەوە دەرکرد:

١- مامەڵە کردن بەو دراوە ئەلیکترۆنییە و هاوشێوەکانی لە ڕوانگەی فیقهی ئیسلامییەوە ئاڵۆز و یاساغ و نادروستە لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

أ- دراوێکی گریمانەییە (عملة إفتراضية) و شەریعەتی ئیسلامییش مامەڵە کردنی بە دراوی گریمانەیی پێ دروست نییە.

---

٢٦ - سورة النحل: الآية ٤٣.

ب- دراوێکی نا دیارە لە هەموو ڕوویەکەوە، واتە: ناڕوونی سەرچاوەی هەیە، چونکە لایەنی دەرکردنی دیار نییە، کە ئەمەش (غرر) ئاڵۆزیو نادیاری دروستدەکات، شەریعەتیش مامەڵەی نادیاری پێ دروست نییە.

ج- دراوەکە لەلایەن هیچ بۆرسەیەکی جیهانییەوە دانی پێدا نەنراوە، مامەڵەی لە تەکدا نەکراوە، هەروەها متمانەی بانکە جیهانییەکانی نییە و هیچ بانکێکی باوەڕ پێکراو لە جیهاندا متمانەی پێنەداوەو هیچ ڕەسیدێکی دیاریشی نیە، تەنها بەڵێندەدرێت بە بەکاربەرەکانی، ئاشکراشە بەڵێنی بەتەنهایش هیچ ئەرزشێکی نییە.

د. نەبوونی گرەنتی فەرمی لە دەزگا ئابورییە پەیوەندیدارەکان، واتە ئەم دراوە هیچ زەمانەتێکی نێو دەوڵەتی ڕاستەوخۆی نییە؛ بۆیە هەر پارەیەك لەو بوارەدا خەرج بکرێت بەرەو نادیاری دەڕوات و وەك قومارکردن وایە.

هـ- ناڕوونەو هیچ سەرچاوەیەك یان نووسینگەیەك یان کۆمپانیایەکی ئابوری دیاری متمانە پێکراوی نییە، بە تایبەت لایەنی فرۆشیار نادیارە، نا دیاری لایەنی فرۆشیاریش کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر دروست نەبوونی مامەڵەکە.

و- گومانی تری زۆری لە سەرە سەبارەت بە نەبوونی مەرجەکانی دروستی مامەڵەی گۆڕینەوەی (الصرف) تیایدا.

٢- لە بازنەی هیچ مامەڵەیەکی شەرعییدا تا ئەم ساتەوەختە جێگەی نابێتەوە.

بۆیە داواکارین لە هاونیشتیمانیان کە خۆیان بە دوور بگرن لە مامەڵە کردن بە دراوی ئەلیکترۆنی بەتایبەت (Onecoin) ە وە؛ چونکە وەکو گوتمان هیچ پرانسیپێکی شەرعی نایگرێتەوە و دوورە لە مەرجو دارِشتەو یاسا شەرعییەکان.

٣- هەرکات هەلو مەرجەکان گۆڕان و توانرا دراوێکی ئەلیکترۆنی بە پێی مەرجە شەرعییەکانی مامەڵە کردن بەرهەم بهێنرێت، دوور لە ساختەکارییو نادیاری و قومارکاری و سپیکردنەوەی سامانو خواردنی ماڵی خەڵك بە ناڕەواو چەتەگەرایی و قەرسەنە کردن، هەروها سەرچاوەیەکی دیاری متمانە پێکراوی نێودەوڵەتی پەیداکرد و لە ژێر چاودێریو کۆنترۆڵی دەزگا ئابوورییە پەیوەندیدارە جیهانییەکاندا بوو، لە کاتی فەوتاندا گرەنتی

قەرەبوو بونەوەی هەبوو، ئەوكات لیژنەی فەتوا فەتوای دیكەی دەبێت، چونكە گرفتەكە لە مامەڵەی بازرگانی ئەلكترۆنی نییە، بەڵكو لە هەلو مەرجو داڕشتەكاندایە.

خودا یارمەتی دەری شەرعزانە.

لیژنەی باڵای فەتوا لە هەرێمی كوردستان

٢٠١٨/٤/٥

بۆ دواجار دكتۆر عەلی قەرداغیش پاش (١٥) مانگ و لە (٢٠١٨/٨/١٩) بڕیاریدا كە مامەڵە كردن بە دراوی ئەلكترۆنی (**OneCoin**) ە وە حەرامەو لەفەتوایەكدا كە ئەمە دەقەكەیەتی دەڵێت:

بسم الله الرحمن الرحيم

ژمارەی دراوە ئەلكترۆنیەكان هەتا ئێستا گەیشتۆتە نزیكی (٩٠٠٠) دراو، لەوانەش (**Bitcoin**) و (**OneCoin**) لە ڕاستییدا ئەو دراوەی كە تائێستا زۆر بەناوبانگە (**Bitcoin**) و (**OneCoin**) ناوبانگێكی ئەوتۆی نییە، تەنها لە كوردستان ئەو رەواجە زۆرەی پێ دراوە، هەتا ئێستا هیچ وڵاتێك دانی بە (**OneCoin**) دا نەناوە، ئەوەی كە هەیە شتی پچڕ پچڕ و متمانە پێكراو نییە، بەڵام دەبێت راستییەك بزانین ئەمە بەشێكە لە دەرهاویشتەكانی سیستمی ئابوری سەرمایەداری، ئەو لەسەر بنەمای قازانج مامەڵە دەكات، لەبەرئەوە گوێ نادا بەوەی دراوەكە دانی پێدا نراوە یان نا، ئەوان بەشوێن باجدا دەگەڕێن، مەبەستیان نییە ماهیەتی ئەو شتە چییە.

لە ساڵەكانی هەشتاكاندا (**option**) سەری هەڵدا، واتە تۆ مافی شتێك دەفرۆشی، سەرەتا كە سەری هەڵدا خەڵك زۆر حەزی لێ دەكرد، بەڵام بەڕای هەموو توێژەرانی بواری ئابوری ئەوە یەكێك بوو لە هۆكارەكانی ئەو قەیرانە ئابوریەی كە جیهان لە ساڵی ٢٠٠٨ هەتا ئێستا

تێی كەوتووە، دەبێت ئێمەش ئەوە بزانین كە نابێت هەر شتێك سیستمی سەرمایەداری دایهێنا ئێمە وەك عورف سەیری بكەین و مامەڵەی پێوە بكەین، ئێمە وەك مسوڵمان بۆچوونی ترمان هەیە كە دەبێت بگەڕێینەوە بۆ بنەماكانی ئابوری ئیسلامی، ئابوری ئیسلامی لەگەڵ موڵكایەتی و بووندا مامەڵە دەكات، مامەڵە لەگەڵ شتی خەیاڵیدا ناكات.

له ئابوری ئیسلامییدا رەگەزەكانی چالاكی ئابوری پشت دەبەستێت بە (٥) بنەما: (بەرهەمهێنان، خەرجكردن، ئاڵوگۆڕ، دابەشكردن، دووبارە دابەشكردن) من دەڵێم دەبێت رەگەزی یەكەم موڵكایەتی بێت لە موڵكایەتییەوە بەرهەم دروست دەبێت لە دواییشدا ئەوەكانی تر.

دەبێت هۆكارێك هەبێت كە تۆ شتێكت هەبێت وەك موڵكی تۆ بناسرێت جا ئەو شتە ماددی بێت یان مەعنەوی، دەبێت ئەو شتەش بوونێكی هەبێت، واتە بەرجەستە بێت بۆئەوەی پێوانە بكرێت، ئەوانەی ئێستا رابەرایەتی ئەو پرۆسەیە دەكەن زۆر ویستیان رای من بزانن، وەفدێكی ئەوانەی (OneCoin) هاتن بۆ قەتەر بەباشی گوێم لێگرتن، بەڵام من پەلەم نەكرد لە فەتواكەدا، من ماوەی شەش مانگ توێژینەوەم لەسەر كرد لە ئەنجامی ئەوەشدا (٥) پرسیاری گرنگم بۆ دروست بوو، من ئەو (٥) پرسیارەم ئاڕاستەی لایەنە پەیوەندیدارەكان كرد، وتم ئێوە وەڵامی ئەو (٥) پرسیارەم بدەنەوە دوایی هەڵوێستی خۆمتان پێ دەڵێم.

یەكەم پرسیارم ئەوەبوو: ئایا ئەم پارەیە كە وەردەگیرێت لە بەرامبەر (OneCoin) دا دەچێتە كوێ؟ بەپێی زانیاری دروست دەچێتە گیرفانی ئەو كۆمپانیایەی كە سەرپەرشتی ئەم پرۆسەیە دەكات و یەك فلس نامێنێتەوە بۆ بەشداربووان.

دووەم: ئایا هیچ كۆمپانیایەك هەیە كە مافی مەعنەوی ئەمانە لەخۆ بگرێت؟

سێیەم: ئایا هیچ وڵاتێك هەیە زەمانەتی ئەم (OneCoin) و (Bitcoin) نانە بكات، بۆ نموونە دیناری عێراقی عێراق پشتیوانی دەكات، ئەی ئەم (OneCoin) ە كێ پشتیوانی دەكات. واتە زەمانەتی نییە.

چوارەم: ئایا هیچ كۆمپانیایەكی پشكدار هەیە كە خۆی بكات بە خاوەنی ئەم دراوانە و وەك بەشێك لە خۆی حسابی بۆ بكات، وە هەر كەسێك پشكێك بكڕێت ببێت بە بەشدار لەو كۆمپانیایە؟

پێنجەم: چ زەمانێك هەیە بۆ ئەو خەڵکانەی کە بەشداریان کردووە لە کاتێکدا کە ئەو دراوە پوچەڵ بکرێتەوە؟

لەگەڵ چەند پرسیارێکی تردا کردمان بە ئینگلیزی و ناردمان بۆیان، بەڵام ئەوان لە جیاتی ئەوەی کە وەڵام بدەنەوە وتیان ئەم پرسیارانە زۆر نهێنی تێدایە، ئێمە ناتوانین بە تەلەفون یان ئیمەیڵ وەڵام بدەینەوە، ئەوان وتیان ئێمە حەز دەکەین سەردانێکمان بکەیت، بەڵام من ئامانجی ئەوان تێگەیشتم، چونکە تەنها ئەگەر وێنەیەکم بگرن لای خۆیان سوودی لێ وەردەگرن بۆ شەرعیەت دان بە دراوەکەیان، من رازی نەبووم بەڵکو داوام لێکردن با ئەوان سەردانم بکەن لە قەتەر یان لە هەر وڵاتێکی تر، بەڵام هەتا ئێستا وەڵامیان نەبووە لە دوای ئەوە دوو چاوپێکەوتنم لەگەڵ جەزیرە ئەنجامدا، یەکەمیان بۆ تەئصیلی دراوی ئەلکترۆنی بوو کە دەبێت چۆن بێت، وتم دەبێت دراوی ئەلکترۆنی لە دوو شت پێکهاتبێت: یەکەم ئەوەی پێی دەڵێن زنجیرەی خوارزمی (Blockchain) ئەمە شتێکی دروستە نابێت ئەمە حەرام بکرێت، چونکە ئایندە و چارەنووسی دراوەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەمە.

بەپێی زنجیرەی دراو دەبێت لە (ئاڵوگۆڕ)ەوە دەست پێ بکات بۆ شمەك، پاشان بۆ دراو پاشان بۆ دراوی کاغەز پاشان بۆ دراوی ئەلکترۆنی، ئەم دراوە ئەلکترۆنیانە هیچ بوونێکی بەرجەستەیان نییە و لە خەیاڵدا مامەڵەیان پێوە دەکرێت، ، وەك ئۆپشنی هەشتاکان وایە، یان وەك مارجن و فۆریکسی ئێستا.

ئەم دراوە مامەڵە پێکردنی لە بانك یان بۆ هەرشتێکی تر حەرامە، با ئەوەی کڕیویەتی بیگەڕێنێتەوەو قازانجەکەشی بخاتە کاری خێرخوازییەوە.

من بەشداریم کرد لە کۆنگرەیەکی نێودەوڵەتی لەسەر دراوی ئەلکترۆنی، چوار پێنج پرۆفیسۆری ئەمریکی بواری ئابوری بەشدارییان کرد، ئەوان وتیان ئێمە پشتیوانی لە قسەکانی دکتۆر عەلی دەکەین و هیچ قسەیەکمان لەسەر قسەکانی ئەو نییە، وتیان ئێمە ڕامان وایە هەموو ئەو دراوانە خەیاڵین، وەك دراو خراونەتە سەر بلۆك چەین.

من پێنج چارەسەرم بۆ دانان:

یەکەم: دەوڵەتێك بیکات بە دراوی دووەمی خۆی، یان بیخاتە پاڵ نەوت و غاز، دراوەکە بەو شتانە پشتیوانی بکرێت لەسەر بنەمای زنجیرەی خواریزمی.

دووەم: یان كۆمپانیایەكی خاوەن پشك رابگەیەنن هەركەس بە چەند كۆین بەشداری كرد بۆی ببێ بە بەش لە كۆمپانیاكە.

دەربارەی (QNET) یش ئەوە لەلایەن زانایانی كۆمكاری فیقهی ئیسلامی حەرام كراوە.

لە كۆتایدا دەڵێم مامەڵەكردن بە هەموو ئەو دراوانەوە روویەكی شەرعییان نیە؛ چونكە خەڵك سەرقاڵ دەكات و پارەیەكی زۆری وڵات روو دەكاتە دەرەوە، واتە پرۆسەیەكە بۆ خواردنی ماڵی خەڵك بە حەرام، كەمینەیەك قازانج دەكات لەسەر حسابی زیانی زۆرینە.

پرۆفیسۆر دكتۆر عەلی قەرەداغی

ئەمینداری گشتی یەكێتی جیهانی زانایانی مسوڵمان

٢٠١٨/٨/١٩

## باسی دووەم:
## حوکمی بەشداری کردن لە کۆمپانیاکانی بازاڕگەری تۆڕبەندی (Network Marketing) (التسويق الشبكى) (Qnet) بە نموونە

- پێشەکی.
- تەوەری یەکەم: سیستەمی (Network Marketing) و پەیوەندی لەگەڵ (Ponzi Scheme).
- تەوەری دووەم: تایبەتمەندییەکانی سیستەمی بازاڕگەری تۆڕبەندی (Network Marketing).
- تەوەری سێیەم: جیاوازیی نێوان سیستەمی (Network Marketing) و مامەڵە شەرعییەکانی تر.
- تەوەری چوارەم: حوکمی شەرعیی بەشداریکردنی لە کۆمپانیای (Qnet) وهاوشێوەکانی.
- تەوەری پێنجەم: بۆچوونی زانایان دەربارەی کاری کۆمپانیاکانی (Network Marketing).
- تەوەری شەشەم: بۆچوونی لیژنەی باڵای فەتوای هەرێم دەربارەی کۆمپانیای (Qnet) و سیستەمی (Network Marketing).
- تەوەری حەوتەم: مەرجەکانی دروستی مامەڵە کردن لەگەڵ کۆمپانیاکانی (Network Marketing).

## پێشەكی:

بابەتی بازاڕگەری تۆڕبەندی (Network Marketing) بابەتێكی كۆنی تازەیە و لەمێژە نێوەندە شەرعی ویاسایی وبازرگانییەكانی بەخۆیەوە سەرقاڵ كردووە و زۆر هەوڵی بنبڕكردنی دەدرێت بەڵام بەداخەوە تا ئێستا وەك دیاردەیەكی دزێو و ئامرازێكی فێڵ و دەستبڕین هەر ماوە و كۆمپانیا لاوازو بێ ئەرزشەكانی دونیای بازرگانی لەپێناو ساغ كردنەوەی كاڵاكانییان و بەدەست هێنانی داهاتی گەورە پەنای بۆ دەبەن.

سەرەتا ئەم كۆمپانیایانە بەسیستەمی بازاڕگەری قوچەكی (التسویق الهرمی) دەستیان پێكرد و ئەو كات كۆمپانیاكان هیچ كاڵایەكیان نەبوو تا بیدەن بەبەشداربوو، وەهەر كەس بیویستایە كاریان لەگەڵ بكات دەبوو بڕێك پارەی بدایە بۆ ئەوەی مافی بەشداربوونی پێ بدرێت.

پاش ئەوەی ئەم سیستەمە هەرەسی هێنا و بەلێشاو پارەی خەڵكی تێدا خورا و چەندین كەسایەتی وبانك وكۆمپانیا بەوهۆیەوە مایەپوچی خۆیان ڕاگەیاند ئەم سیستەمە لەزۆربەی وڵاتانی دونیا یاساغ و قەدەغە كرا.

دواتر و بۆ خۆدزینەوە لەیاساكان و حوكمە شەرعییەكان وبەمەبەستی چەواشەكاری ئەندامان وهەوادارانیان كۆمپانیاكان هەستان كۆمەڵێك كاڵایان دروست كرد وئەمجار گوتیان بەشداربوو كاڵا دەكڕێت لەكۆمپانیا و لەبەرامبەر كڕینی كاڵاكان پارە دەدات نەك وەك مافی بەشداربوون.

ئەم قسەیەش دوورە لەڕاستییەوە چونكە كاڵاكان تەنها ئامرازن و ئامانج نین لە گرێبەستەكاندا و بە پێی دانپێدانانەكانی كۆمپانیای (Qnet) خوی تەنها لە (١٨٪) ی بەشداربووان كاڵاكانیان پێویستە ولە (٨٢٪) ە كەی تری بەمەبەستی بەشداربوونی سیستەمەكە كاڵاكان دەكڕن، هەرچەندە ئەو ڕێژەیەیش جێی گومانە بەڵام بابڵێین وایە، كەواتە وەكو گوتمان كاڵاكان تەنها بۆ خۆدزینەوەیە لەیاساكان و حوكمە شەرعییەكان و سڕینەوەی ناوبانگی بەدی پێشوی كار و سیستەمەكەیانە، نرخی گرانی كاڵاكانیش كەچەند قات زیاترن لەنرخی بازاڕ سەلمێنەری ئەو ڕاستییەن كەئەو پارە زیادەیە نرخی بەشداربوونە نەك كاڵا كڕین.

بۆ خۆقوتاركردنێش لەهەر بڕیارێكی شەرعی و بەدواداچوونێكی یاسایی ئەم جۆرە كۆمپانیایانە ناو بە ناو ناوی خۆیان دەگۆڕن و هەر جارە و لەبەرگێكدا و بەناوی كاڵایەكی نوێ و لەوڵاتانێكدا كە بەدەست هەژاری و بێكارییەوە دەناڵێنێت و یاساكان تێیدا بەپێی پێویست نین، سەرهەڵدەدەن و خەڵكانێكی نەشارەزا و خۆشباوەڕ و بێكار دەكەنە ئامانج و فریویان دەدەن.

تا ئێستا زیاتر لە (٧٠٠٠) كۆمپانیای لەم شێوەیە هاتوونەتە بوون بەڵام هیچ كامیان نەك نەیانتوانیوە ڕوویەكی گەشی بازرگانی نیشان بدەن و ببنە ژمارەیەكی دیار لەنێوەندە ئابوورییەكانی جیهان و ناوبانگێكی باش بۆ خۆیان و كاڵا و كرێگرتەكانییان دروست بكەن، بەپێچەوانەوە هەمیشە سەریان لە دەستبڕی ومایەپوچییەوە دەرچووە.

هەرچەندە بەندە بەر لە نزیكەی (١٥) ساڵ و لەسەردەمی سەرهەڵدانی كۆمپانیای (GoldCoast) بۆچونم ڕوون بووە لەو بارەیەوە و بەشداریكردنم لەو جۆرە كۆمپانیایانە بەحەرام زانیوە و لەپەڕتووكی (دیاردەی سوخۆری لەمامەڵە هاوچەرخەكاندا) و دەربارەی كۆمپانیای (مێگا هۆڵدین) یش هەمان قسەم كردوە. بەڵام ئێستایشی لەگەڵ بێت و بەهۆی فێڵ و دەستگۆڕینی كۆمپانیاكانەوە خەڵكی بەردەوام لەڕێی سەردان و نامە و تەلەفون و تۆڕەكۆمەڵایەتییەكانەوە پرسیارمان دەربارەی حوكمی شەرعی مامەڵە كردن لەگەڵ ئەو جۆرە كۆمپانیایانە لێ دەكەن.

بۆیە بەگرنگم زانی ئەم توێژینەوەیە بۆ ئەو بابەتە تەرخان بكەم و ئەم جارە كۆمپانیای (Qnet) وەك نموونە باس بكەم كە ئێستا خەڵكێكی زۆری بەخۆیەوە سەرقاڵ كردوە، ئەمەیش ئەوە ناگەیەنێت كەتەنها مەبەستم لەقسەكانم كۆمپانیای (Qnet) بێت بەڵكو (Qnet) تەنها وەك نموونە باس دەكەم و هەر كۆمپانیایەكەی تریش كە بە سیستەمی (Network Marketing) كار بكات لە دیدی مندا هەمان حوكمی هەیە و ئەگەر جیاوازییەكی لاوەكیشیان هەبێت لە ناودا یاخود لە هەندێك وردەكاریدا ئەوە لە ناوەڕۆك و بنەڕەتدا هەموویان بەهەمان سیستەم كار دەكەن و وەك یەكن و ئەو جیاوازییە لاوەكییانە كاریگەری لەسەر گۆڕینی حوكمە شەرعییەكەیان نابێت.

بۆیە ئامانجی نووسینی ئەم توێژینەوەیە:

- تیشك خستنە سەر كاری ئەو كۆمپانیایانەیەو ناساندنیانە كە بەداخەوە هەندێكیان كوردستانیان كردۆتە ئامانج و سوودیان لە قەیرانی هەژاری و بێكاری و لەرزۆكی دەسەڵات و بۆشایی یاساكان وەرگرتووە و خەڵكانێكی زۆریان كردۆتە قوربانی و هەندێكیان تا ئێستایش لەسەر كارەكانیان بەردەوامن و دیارترینیشیان كۆمپانیای (QNet) (Forever Living) (DXN Holdings Bhd) (Avon) كە هەموویان بەهەمان سیستەم كار دەكەن و تەنها جۆری كاڵاكانیان جیاوازە.

- هۆشیاركردنەوەی خەڵكە لەمەترسی كار كردن لەگەڵ ئەم جۆرە كۆمپانیایانە و هاوشێوەكانیان لە ڕووی شەرعی و یاسایی و بازرگانییەوە.

- بەرچاوڕوونیدانە بەنێوەندە شەرعی و یاساییەكان تا بڕیاری یەكلاكەرەوە و بنبڕكەر لەسەر كاری ئەم كۆمپانیایانە بدەن.

میتۆدی توێژنەوەكەیش میتۆدێكی شیكاری بەراوردكارییە و هەوڵ دەدەم بە زمانێكی زانستی سادە شێوازی كاری كۆمپانیاكانی (Network Marketing) ڕوونبكەمەوە و بەراوردی بكەم بە سیستەمە بازرگانییە شەرعییەكان و خاڵە لە یەكچوو و جیاوازەكانیان دەستنیشان بكەم و لەسەر ئەو بنەمایەیش حوكمی شەرعییان گەڵاڵە بكەم.

سەبارەت بە پەیكەری توێژینەوەكەیش: توێژینەوەكە لە حەوت تەوەر پێكدێت:

تەوەری یەكەم سەرەتایەكە لەسەر **سیستەمی (Network Marketing) و پەیوەندی لەگەڵ (Ponzi Scheme)، تەوەری دووەمیش تایبەتە بە باسی تایبەتمەندییەكانی سیستەمی بازاڕگەری تۆڕبەندی (Network Marketing)، لەتەوەری سێیەمدا قسەم لەسەر جیاوازیی نێوان سیستەمی بازاڕگەری تۆڕبەندی و مامەڵە شەرعییەكانی تر كردووە، تەوەری چوارەم و پێنجەم و شەشەمیشم تەرخان** كردووە بە ڕوونكردنەوەی حوكمی شەرعی بەشداریكردن لە كۆمپانیای (Qnet) و بۆچوونی زانایان لەو بارەیەوە و بە تایبەتی بۆچوونی لیژنەی باڵای فەتوای هەرێم كە چەند فەتوایەكیان لەو بارەیەوە داوە و تەوەری حەوتەم و كۆتاییشم تەرخان كردووە بۆ باسكردنی ئەو مەرجانەی كەئەگەر كۆمپانیاكان پێیانەوە پابەند بن حوكمی كارەكەیان دەگۆڕێت و حەڵاڵ دەبێت.

## تەوەری یەکەم:
## سیستەمی (Network Marketing) و پەیوەندی لەگەڵ (Ponzi Scheme)

بەر لەوەی بچینە سەر ناوەڕۆکی باسەکەمان ڕاستییەك هەیە پێویستە هەموو لایەك بیزانێت، ئەویش ئەوەیە کە سەرجەم ئەو کۆمپانیایانەی کە بە سیستەمی (Network Marketing) کار دەکەن لە کارەکانیاندا پلانی (Ponzi) پەیڕەو دەکەن، کەسێکیش بیەوێت لە سیستەمی کارەکەیان شارەزا بێت دەبێت سەرەتا لە پلانی (Ponzi) شارەزا بێت؛ بۆیە سەرەتا پێناسەی پلانی (Ponzi) دەکەین تا لای هەموو لایەك ڕوون بێت پەیوەندی نێوانی ئەو پلانە و کاری ئەو کۆمپانیایانەی کە بە سیستەمی (Network Marketing) کار دەکەن چییە و چۆنە.

پلانی (Ponzi) سیستەمێکی بازرگانی ساختەکارییە و بەناوی (تشارلز پۆنزی) خاوەنییەوە ناونراوە.

(تشارلز پۆنزی) پیاوێکی کۆچبەری بەنەژاد ئیتاڵییە و ساڵی (١٩٠٣) دەچێتە شاری (بۆستن) لە ئەمریکا و هەر لەسەرەتای کۆچەکیدا و لەسەر ئەو کەشتییەی کە کۆچی پێ دەکات بەرەو ئەمریکا هەموو پارەکانی بە قومار دەدۆڕێنێت و کاتێك دەگاتە ئەمریکا تەنها دوو دۆلارو نیوی پێ دەمێنێت، بۆیە بەناچاری دەبێتە شاگرد لە یەکێك لە چێشتخانەکاندا و پاش ماوەیەك لەسەر دزیکردن لەکارەکەی دەردەکرێت.

ساڵی (١٩٠٧) دەچێتە کەنەدا و لەوێ لەیەکێك لە بانکەکان دادەمەزرێت و پاش ماوەیەکی کەم دەبێتە بەڕێوبەری بانك، لە ماوەی کارکردنی لەو بانکە سەرنج دەدات کە خاوەنی بانکەکە ڕێژەی (٦٪) سوو دەداتە ئەو کەسانەی کە پارەکانیان لە بانك دادەنێن ئەمەیش دوو هێندەی ئەو بڕە پارەیەیە کە بانکەکانی تر دەیدەن بە خاوەن سەرمایەکان، پاش لێکۆڵینەوە پۆنزی بۆی دەرکەوت کە خاوەنی بانك ئەو ڕێژە زۆرەی سوو کە دەیداتە خاوەن سەرمایەکان هی قازانج نییە، بەڵکو لەسەرمایەی بەشداربووە تازەکان دەداتە بەشداربووە کۆنەکان، هەر بەو هۆیەیشەوە پاش ماوەیەکی کەم ئەو بانکە ئیفلاسی کرد و خاوەنەکەی ڕایکرد بۆ مەکسیك و پۆنزیش بە تۆمەتی ساختەکاری بۆ ماوەی سێ ساڵ زیندانی کرا.

پاشان پۆنزی گەڕایەوە بۆ ئەمریكا و لەوێ دەستیكرد بە بردنی خەڵك لە ئیتاڵیاوە بەرەو ئەمریكا بەقاچاخ و لەسەر ئەو كارەیش لە (ئەتلەنتا) بۆ ماوەی دوو ساڵ زیندانی كرا.

دواتر گەڕایەوە بۆ (بۆستن) و لەوێ نیشتەجێبوو و ئەمجار دەستی كرد بە كڕین و فرۆشتنی پولی بەریدی نێودەوڵەتی و هەنگاو بە هەنگاو كارەكەی فراوان كرد، پۆنزی لەپێناو دەستخستنی داهات و دەستمایەی بەلێشاو هەمان ئەزموونی بانكە كەنەدییەكەی دووبارە كردەوە بەڵام زۆر لەو سەرسوڕهێنەرتر و بەڕێژەی قازانجی (٥٠٪) بۆ ماوەی (٤٥) ڕۆژ و (١٠٠٪) بۆ ماوەی (٩٠) ڕۆژ دەدایە كەسی بەشداربوو، ئەمە لەكاتێكدا كە پڕ داهاتترین بانكەكانی ئەو كات تەنها ڕێژەی (٥٪) یان دەدایە خەڵكی ئەویش ساڵانە نەك بۆ (٤٥) ڕۆژ.

ئەم ڕێژە زۆرەی قازانجی پلانەكەی پۆنزی خەڵكی وا مەست كردبوو كە خەڵكی هەرچی موڵك وماڵیان هەبوو دەیانفرۆشت و پارەكەیان ڕادەستی ئەو دەكردو زۆرێكیان قازانجی پارەكانیشیان وەرنەدەگرتەوە بەڵكو داوایان دەكرد لە كارەكەدا بمێنێتەوە تا قازانجی زیاتر بكەن، ئیتر كەس نەیدەپرسی ئاخۆ ئەم پارە و داهاتە بەلێشاوانە داهاتی ڕاستەقینەن یان وەهمی؟. باشە ئەگەریش قازانجی ڕاستەقینەن تۆ بڵێی تا چەند یاسایی بن؟ باشە ئەگەریش یاسایین ئەی بۆ لە هیچ شوێنێكی تری دونیا نەك ئەمریكا پڕۆژە و داهاتی وا نییە؟!.

پۆنزی بەم شێوەیە توانی لە ماوەی ساڵێكدا نزیكەی (٢٠) ملیۆن دۆلار كۆبكاتەوە و پڕۆژەكەی هاوشێوەی  تۆپی بەفر تا دەهات گەورەتر دەبوو، ئەمەیش وایكرد ئەو قازانجە خەیاڵییەی بەڵێنی دابوو بیداتە بەشداربووانی پڕۆژەكەی ئیتر نەتوانێت بیدات، بۆیە ناچار بوو لەدەستمایەی بەكاربەرە تازەكان پارەی قازانجی بەكاربەرە كۆنەكان بدات ئەمە پاش ئەوەی كە پشكی شێری لە داهاتەكان بۆ خۆی هەڵدەگرت.

پلان و پڕۆژەكەی پۆنزی پرسیاری لای زۆرێك لە نێوەندە بازرگانی و یاسایی و ڕاگەیاندنەكان درووستكردبوو كە چۆن دەبێت ئەو دەستمایە و قازانجە زەبەلاحانە بەرهەمی بازرگانییەكی یاسایی ڕێگەپێدراو بن، ئەمە مەحاڵێكی عەقڵی و بازرگانی بوو، بۆیە هەندێك لەو نێوەندانە و بەتایبەتی داواكاری گشتی بڕیاریدا بەدواداچوون بۆ كارەكانی كۆمپانیاكەی پۆنزی بكات و پاش لێكۆڵینەوە دەرەنجام ئەو ڕاستییە تاڵەیان بۆ دەركەوت كە ئاو داهاتانە

ڕاستەقینە نین و هیچ پەیوەندییەكیان بە بازرگانیكردن بە پولی بەریدیەوە نییە و هەر دەستماییەی خاوەن دەستمایەكان خۆیانە و كراون بەچەند چینێكەوە و بەپێی مێژووی بەشداربوونیان و بەچەند پێوەرێك بەشێك لە سەرمایەی بەشداربووە تازەكان دەچێت بۆ چینەكانی سەرووی خۆیان و ئەم ڕاستییانەیش لە چەند ڕاپۆرتێكی ڕۆژنامەوانیدا بلاو كرانەوە.

دواتر و لە ساڵی (١٩٢٢) كۆمپانیاكەی پۆنزی داخرا و پۆنزی نزیكەی (٧) ملیۆن دۆلاری ئەوكاتەی بەشداربووەكانی خوارد و بەو هۆیەیشەوە خۆێشی بۆ جارێكی تر بەتۆمەتی دزی و دەستبڕین خرایە زیندانەوە و تا ساڵی (١٩٣٤) لە زیندان مایەوە و پاش ئازاد كردنی ئەمریكا ڕادەستی ئیتاڵیای كردەوە و لەساڵی (١٩٤٩) پۆنزی بە هەژاری لە نەخۆشخانەیەكی خەیری لە (ریۆدی جانیرۆ) لە بەرازیل كۆچی دوایی كرد.

هەرچەندە پۆنزی مرد بەڵام پلانە ساختەكارییەكەی لەگەڵی نەمرد و لە پاش خۆی نازناوی (پلانی پۆنزی) بەسەردا بڕا و پوختەی پلانەكەی ئەوەبو كە كەسێك یان كۆمپانیایەك لە جیاتی دابەشكردنی قازانجی بەدەستهاتوو لە چالاكییە بازرگانییەكانی بەسەر خاوەن پشكەكان، هەڵدەستێت بە پێدانی بڕێك لەو سەرمایەیەی كە لەلایەن وەبەرهێنەرە نوێكانەوە دەستی دەكەوێت بە وەبەرهێنە كۆنەكان.

ئێستایشی لەگەڵ بێت دەیەها و سەدەها كۆمپانیا كار بەم سیستەمە دەكەن و لەسەری دەڕۆن و هەرجارە و كۆمپانیایەك بەناوێكی نوێ وبەبیانوی كالایەكی نوێوە بانگەشەی بۆ دەكات و كۆتا پرۆژەی شكستخواردووی لەو جۆرەیش پرۆژەكەی (برنارد مادۆف) ی بەڕێوبەری جێبەجێكاری كۆمپانیای (نازداك) ئەمریكی بوو كە ساڵی (٢٠٠٨) لەئەمریكا دەستگیر كرا و نزیكەی (٦٠) ملیار دۆلاری خەڵكی خوارد و نەك تەنها بە ئەمریكا بەڵكو زیانێكی زۆری بە بانكەكانی فەڕەنسا و ئیتاڵیا و سویسرا و ئیسپانیا گەیاند و بڕیاری (١٥٠) ساڵ بەندكردنی بەسەردا سەپا وئێستا ژیانی لەبەندینخانە بەسەر دەبات[٢٧].

---

٢٧ - أ.د. محمد إبراهيم السقا، مقال بعنوان، مخطط بونزي، الجمعة ٢ يوليو ٢٠١٠، موقع: http://www.aleqt.com/٢٠١٠/٠٧/٠٢/article_٤١٤٢١٠.html.

https://drive.google.com/file/d/0B1tr6WldzmFVSGdCRzBDUGw4SHc/view https://www.bestmlmmarketing.com/.

## تەوەری دووەم:
## تایبەتمەندییەکانی سیستەمی بازاڕگەری تۆڕبەندی
## (Network Marketing)

سیستەمی بازاڕگەری تۆڕبەندی کۆمەڵێك تایبەتمەندی خۆی هەیە وهەر کەس بیەوێت ئەو کۆمپانیایانە بناسێتەوە کە بەم سیستەمە کاردەکەن دەتوانێت لەڕێگەی ئەم تایبەتمەندییانەوە بیانناسێتەوە:

١- نەناسراوی وبێ ئەزموونی: ئەو کۆمپانیایانەی ئەم جۆرە سیستەمە بەکار دەهێنن بۆ ساغ کردنەوەی کاڵاکانیان هیچ کامیان کۆمپانیای خاوەن سەنگ و ناسراو و بەئەزموون نین، بەڵکو کۆمەڵێك کۆمپانیای نەناسراو و بێ ئەزمونن و وەك بڵقی ئاو لەپڕ گەورە دەبن و دەتەقن.

٢- پرۆژە و کاڵای سادە: ئەو پڕۆژە و کاڵایانەی ئەم جۆرە کۆمپانیایانە کاری لەسەر دەکەن زۆر سادەن و تێچوویەکی ئەوتۆیان نییە وهەموو کەس دەتوانێت بەئاسانی لێیان تێ بگات و بیانکڕێت و بۆ خەڵکیان باس بکات و کار بۆ ساغکردنەوەیان بکات، بەمەیش کۆمپانیا دەتوانێت بە تێچوویەکی کەم زۆرترین کەس لەخشتە ببات و فریو بدات و پەلکێشی ناو سیستەمەکەیان بکات.

٣- هەڵنان وفریودان بەکاری کەم وقازانجی زۆر: ئەمە سیمایەکی تری کۆمپانیا پۆنزییەکانە کە کاتێك دەیانەوێت کەسێك بخەنە داوی خۆیانەوە بەشان و باڵیدا هەڵدەدەن و دەیەها بەڵێنی درۆی پێ دەدەن کە تۆ کەسێکی بەتوانایت و دەتوانیت لەماوەیەکی کەمدا لەگەڵ ئێمە قازانجێکی زۆر بەدەست بهێنیت و دەوڵەمەند بیت و کارەکەیش زۆر قورس نییە و دەتوانیت لەڕێی چەند پەیوەندییەکی تەلەفۆنی یان نامەیەکی ئەلکترۆنی یان چەند وانەیەکی تیۆری ئەنجامی بدەیت. ئەم هەلەیش نەك تەنها بۆ خۆتە بەڵکو دەتوانیت لەڕێی کۆمپانیاکەی ئێمەوە خزمەت بەهاوڕێ و خزمەکانیشت بکەیت و بیانهێنیتە ناو پڕۆژەکەوە و لەبێکاری و هەژاری ڕزگاریان بکەیت و ئەم هەلەیش تەنها لای ئێمە دەست دەکەوێت و هیچ پڕۆژەیەکی تر نییە بتوانێت ئاوها لەماوەیەکی کەمدا بتکاتە خاوەن دەوڵەت و دەستمایە.

ئيتر ئەوەندەی بەگوێدا دەخوێنن تا كەسەكە خۆی لێ دەگۆڕێت وپێی خۆشە هەرچی هەیە بیخاتە خزمەتی ئەوان و پڕۆژە وەهمیەكانیانەوە.

٤- دروستكردنی متمانە لەڕێی خەڵكانی ترەوە: بۆ ئەوەی بەشداربو متمانە بەم جۆرە كۆمپانیا وپڕۆژانە بكات كۆمپانیا هەوڵ دەدات خەڵكانی خاوەن سەنگ و سەر ڕاست بەشداری پێ بكات و بیانكاتە دەلاڵی كالا و پڕۆژەكانی، هەر لەو پێناوەیشدا كۆمپانیا ئەو قازانجە خەیاڵییەی بەڵێنی پێدەدات دەیداتە هەندێك لەو بەڕێوبەر وهەڵسوڕاوە دیارانە و وەك نموونە دەیانهێنێتەوە كە ئەوانە مانگانە ئەوەندە قازانج دەكەن و هەموو كەس دەتوانێت وەك ئەوان قازانج بكات و بگرە زیاتریش. بەڵام ئەمە تەنها قسەیە وئەو ئۆفەرە تەنها بۆ كەسانێكی دیاری كراو وسنووردارە وئەو داهاتەیش لەبرە قازانجی ئەو بەشدابوانەی لەڕێی ئەمانەوە فریو دراون پێیان دەدرێت نەك لەبرە قازانجی كۆمپانیا خۆی و هەر ڕۆنی خۆیانە و دەیداتەوە لەسمێڵی خۆیان.

٥- بەئامانجگرتنی گشت چینەكانی كۆمەڵگە: هەرچەندە (تشارلز پۆنزی) كاتی خۆی تەنها كاری لەسەر ڕوتاندنەوەی چینی سەرمایەدار ودەوڵەمەندەكان دەكرد بەڵام كۆمپانیا پۆنزییەكان لەئێستادا كار لەسەر گەوجاندنی گشت چین وتوێژەكانی كۆمەڵگە دەكەن بێ جیاوازی؛ چونكە لەوە تێگەیشتون كە كار كردن لەسەر ئەو چینە بەتەنها هەڵەیە لەچەند ڕویەكەوە:

أ- لەبەر ئەوەی دەوڵەمەندەكان هەمیشە كەمینەی كۆمەڵگەن و زۆرینە هەمیشە چینی هەژار و خاوەن داراییە مام ناوەندەكانن بۆیە لەپێناو زۆركردنی داهات پێویستە كار لەسەر ڕووتاندنەوەی هەموو چینەكان بكرێت نەك تەنها چینێكی دیاریكراو.

ب- دەوڵەمەندەكان شارەزای بواری بازرگانین و بە ئاسانی فێڵیان لێ ناكرێت، بەڵام چینەكانی تر ئەو شارەزاییەیان نییە و ئاسانتر فێڵیان لێدەكرێت و دەستەمۆ دەكرێن.

ت- چینی دەوڵەمەند بێمنەتە لە زیانكردن، بۆ نموونە: كەسێك پارەیەكی زۆری هەیە كالایەكی كڕیوە بە (٢٥٠٠$) بەڵام ئێستا كالاكە (٥٠٠$) دەكات زۆر بە خەمی پڕكردنەوەی ئەو زیانەی نییە، بەڵام ئەوەی باری دارایی مام ناوەندە یان هەژارە و چووە قەرزی كردوە تا كالاكەی كڕیوە ناتوانێت بەئاسانی واز بهێنێت بۆیە پێویستە هەوڵ بدات بۆ ئەوەی قەرزەكەی

بداتەوە و زیانی نرخی گرانی كاڵاكەی پڕ بكاتەوە و تاكە ڕێگایش بۆ ئەمە پەیداكردنی كڕیار و بەكاربەری نوێیە بۆ كۆمپانیا.

پ- دەوڵەمەندەكان كەمینەیەكی سەلامەت و لاشەڕن وئامادە نین لەبەر پارەیەكی كەم خۆیان تووشی گرفت و سەریەشە بكەن، بەڵام چینی مام ناوەند و تایبەت تر هەژارەكان لەپێناو بژێوی ژیانی خۆیان و خانەوادەكانیان هێزێكی مرۆیی و پشتیوانێكی باش بۆ كۆمپانیا دروست دەكەن.

بۆیە لە ئێستادا كۆمپانیا پۆنزییەكان مافی كڕین و بەشداربوون بەهەموو كەس دەدەن، ئیتر پیر بێت یان گەنج یان منداڵ، نێر بێت یان مێ، خوێندەوار بێت یان نەخوێندەوار، هیچ لەدونیای كار و بازرگانی بزانێت یان نا ئەوانە هیچیان بەلای كۆمپانیاوە گرنگ نین. گرنگ ئەوەیە كۆمپانیا زۆرترین بەشداربووی هەبێت و زۆرترین ڕێژەی كاڵا ساغ بكاتەوە بەگرانترین نرخ.

٦- هەمەڕەنگی كاڵاكان: هەر لەپێناو خاڵی سەرەوە كۆمپانیا پۆنزییەكان تەنها لەیەك بوار و لەسەر یەك جۆر كاڵا كار ناكەن بەڵكو كار لەسەر چەندین كەرت و ساغكردنەوەی چەندین جۆر كاڵا دەكەن لەوانە: (نەوت، ئاڵتون، سەعات، فلتەری ئاو، ملوانكە وبازنی پزیشكی، پێداویستی تەندروستی وجوانكاری، كەرتی گەشتیاری، پەیج وسایتی ئەلكترۆنی، كەرتی زانستی وخوێندن) وچەندین شتی تری دوور لەیەك، كەكۆمپانیا دەیەوێت لەڕێگەیانەوە زۆرترین ڕێژەی بەشداربوو بكاتە كرێگرتەی خۆی و بەم شێوازەیش تا بێت بەشداربووانی كۆمپانیا زیاد دەكات هەر بۆیە ئەم سیستەمە بەتۆپی بەفر ناوزەند دەكرێت چونكە تا بێت قەبەتر و فراوانتر دەبێت.

٧- بەتۆڕ كاركردن: ئەم جۆرە كۆمپانیایانە بۆ ئەوەی زۆرترین ڕێژەی كاڵا بەگرانترین نرخ ساغ بكەنەوە پشت بەتۆڕبەندی بەشداربووانیان دەبەستن، چونكە ئەوان مافی بەشداربوون نادەنە هیچ كەس تاخۆی كاڵاكە نەكڕێت و هیچ قازانجێكیشی پێ نادەن تا چەندین كەسی وەك خۆی ڕازی نەكات كە ئەوانیش بێن وەك ئەم كاڵاكانی كۆمپانیا بكڕن، بەشداربوویش لەپێناو قازانجی خۆی و پڕكردنەوەی زیانی كڕینی كاڵاكەی بەچەند قاتی نرخەكەی خۆی، دەبێت بڕوات بانگەشە بۆ كۆمپانیا بكات و بەشان و باڵی كاڵا و داهاتەكەیدا

هەڵبدات تا كۆمەڵێك كەسی تر قەناعەت پێبكات ئەوانیش بێن كاڵا لەكۆمپانیا بكڕن و ئەو كەسانەی لەڕێی ئەمەوە بەشداری لەكۆمپانیادا دەكەن لەژێر باڵی ڕاست و چەپیدا بەشێوەیەكی یەكسان دابەش دەبن و هەر یەك لەوانیش لەپێناوی قازانجی خۆیان دەبێت بڕۆن كۆمەڵێكی تر پەلكێش بكەن بۆ كۆمپانیا و بەم شێوەیە كارەكە بەردەوام دەبێت تا خاڵی بێ كۆتایی. بەمەیش كۆمپانیا كاڵایەكی زۆر و قازانجێكی بێ شومار دەكات بەبێ ئەوەی یەك سەنت لەڕیكلام سەرف بكات یان لەداهاتی خۆی بداتە بەشداربووان.

٨- درۆ و فێڵ و هەڵخەڵەتاندن: ئەمە یەكێكی ترە لەبنەماكانی كاری ئەو كۆمپانیایانەی كە بە سیستەمی (Network Marketing) كار دەكەن و ئەم درۆ و هەڵخەڵەتاندنەیش نەك لەیەك ڕوو بەڵكو لەچەند ڕوویەكەوەیە لەوانە:

أ- نرخی كاڵاكان: نرخی كاڵاكانیان زۆربەی كات لە نرخی هاوشێوەكانیان لە بازاڕدا زیاترە.

ب- كوالیتی كاڵاكان: كۆمپانیا پاساوی گرانی نرخی كاڵاكانی بە باشی كوالیتییەكەی دێنێتەوە، كە گوایە ئەم كاڵایانە بۆیە گرانن چونكە ماركەن و لەهیچ شوێنێكی دونیا وێنەیان نییە، ئەمەیش درۆیەكی شاخدارە چونكە زۆرێك لە كاڵاكانیان ساختەن و هی ئەو شوێنانە نین كەبانگەشەی بۆ دەكەن، یان گوایە كاڵاكانیان دەگمەن و دانسقەن و تەنها لەكۆمپانیاكەی ئەمان دەست دەكەون، ئەمەیش هەر درۆیە؛ چونكە ئەوان مۆرێك یان لۆگۆیەكی تایبەت بەخۆیان دروست دەكەن و مافی خاوەندارێتی لەنێوەندە بازرگانییەكان بۆ وەردەگرن كەئیتر هیچ كەس بۆی نییە لەو مۆرەی ئەوان یان ئەو لۆگۆ و دروشمە بەكار بهێنێتەوە وهەر كەس ئەو كارە بكات ڕوبەڕوی لێپێچینەوەی یاسایی دەبێتەوە. پاشان ئەو مۆرە یان لۆگۆیە دەدەن لەكاڵاكان و دەڵێن لەدونیا وێنەی نییە، ئاخر كەوێنەی نییە نەك لەبەر بەرزی كوالیتی وباشی كانزاكەیەتی بەڵكو لەبەر ئەوەیە كەخاوەندارێتی بۆ كۆمپانیا دەگەڕێتەوە ئەگەرنا شتی زۆر لەوانەی ئەوان باشتر و كوالیتی بەرزتر و هەرزانتر لەبازاڕدا هەیە.

ت- كۆمپانیا بەشداربووانی بەوە فریودەدات كەئێمە لەبری ئەوەی پارەی ڕیكلام وكردنەوەی بازاڕ بۆ كاڵاكانمان بدەینە كۆمپانیا و دەزگاكانی ڕاگەیاندن ئەو پارەیە دەدەینە خەڵكانێكی بێكار و هەژار و هەلی كاری بۆ گەنجان پێ دەدۆزینەوە، ئەم قسەیەش سەرلەبەری

درۆو هەڵخەڵەتاندنە؛ چونكە كۆمپانیا نەك هیچ پارەیەك ناداتە بەكاربەرەكانی خۆی بەڵكو لەو نرخە زۆرەی كۆمپانیا لەساغكردنەوەی هەر كالأیەك دەستی دەكەوێت كەمێكی دەداتەوە ئەو كەسەی كە بەشداربووەكەی هێناوەتە ناو سیستەمەكەوە، ئەمە لەلایەك لەلایەكی ترەوە ئێستا كاری ڕیكلام كردن پارەیەكی ئەوتۆی ناوێت و هەر كەس بیەوێت دەتوانێت لەڕێگەی پەیجێكی ئینتەرنێت یان سایتێك ڕیكلام بۆ هەر كالأیەك بكات كەخۆی دەیەوێت بەبێ ئەوەی شتێكی ئەوتۆی تێبچێت. كەواتە ئەم تۆڕبەندی وسیستەمە ئالۆزە بۆچی؟!!.

یان ئەگەر ئەم سیستەمە باش و سەركەوتوە بۆ ڕیكلام كردن خێرە كۆمپانیا خاوەن سەنگ و براندە جیهانییەكان بەكاری ناهێنن و بەم سیستەمە كار ناكەن، بۆچی تەنها كۆمپانیا لاواز و بێ ناسنامانەكان كار بەم سیستەمە دەكەن بۆ ساغكردنەوەی بەرهەمە بێ بەهاكانیان ئایا ئەقڵی بازرگانی ئەمان لەوان گەورەتر و باشترە؟!.

نەخێر بەڵكو هاوكێشەكە بەپێچەوانەوەیە ئەوان بەمشێوەیە نەك هەر پارەی بانگەشە و ڕیكلام بۆ كالأكانیان نادەن بەڵكو بەپێچەوانەوە پارەی پێ پەیدا دەكەن، چونكە كۆمپانیا مافی بەشداربوون لەسیستەمەكە ناداتە هیچ كەس تاخۆی كالأكە نەكڕێت و سەرەڕای ئەوەیش هەر هیچی ناداتێ تاچەندین كەسی وەك خۆی قەناعەت پێ نەكات ئەوانیش كالأكانی كۆمپانیا بكڕن، دواتر و لەو پارە زۆرەی لەساغكردنەوەی كالأكان دەستی كەوتوە، بەشێكی كەمێكی دەداتە ئەو كەسە، بەمەیش بەشداربووان بەبێ ئەوەی هەست بەخۆیان بكەن نەك دەبنە كرێكار و بانگەشەكاری بێبەرامبەری كالأكانی كۆمپانیا بەڵكو پارەیشیان داوەتە كۆمپانیا تا شەرەفی ساغ كردنەوەی كالأكانی كۆمپانیایان پێ بدرێت!!! .

ئەمانە گرنگترین تابەتمەندی وبنەماكانی كاری كۆمپانیا پۆنزییەكانن كە بە سیستەمی (NetworkMarketing) كار دەكەن.

## تەوەری سێیەم:
## جیاوازیی نێوان سیستەمی (Network Marketing) و مامەڵە شەرعییەکانی تر

بەمەبەستی بەلاڕێدابردن و چەواشەکردنی خەڵکانی سادەو نەشارەزا هەڵسوڕاوانی کۆمپانیاکانی (Network Marketing) بەردەوام لەهەوڵی ئەوەدان کە خاڵی هاوبەشی نێوان سیستەمی کارەکەی خۆیان و ئەو سیستەمە بازرگانییانەی کەلەشەرعدا ڕێگەپێدراوە زەق بکەنەوە و حاڵەتی لەیەکچوونیان بسەلمێنن بۆ ئەوەی لەو ڕێگەیەوە شەرعییەت بەکارەکەیان بدەن.

بۆیە لەم تەوەرەیەدا باسی ئەو مامەڵە شەرعییانە دەکەین کە لە ڕوکەشدا لەکاری کۆمپانیاکانی (Network Marketing) دەچن یاخود خاڵی هاوبەشیان هەیە، بەڵام لە ڕاستی و ناوەڕۆك و ئەنجامدا حوکمەکانیان جیاوازە وئاماژە بەهۆکاری جیاوازییەکانیان دەدەین بۆ ئەوەی خەڵك ڕاستییەکانی لا ڕوون بێتەوە وچیتر بەو قسانەی ئەوان فریو نەخوات.

گرنگترینی ئەو مامەڵانەیش کەدەچنە ناو ئەم بازنەیەوە ئەمانەن:

**١- کرێی بریکاری** (الوكالة) **یان دەڵاڵی** (السمسرة):

هەڵسوڕاوانی کۆمپانیا پۆنزییەکان کەکار بە سیستەمی (Network Marketing) دەڵێن ئەو پارەیەی ئێمە دەیدەینە بەشداربووانی خۆمان و ئەو کەسانەی کاڵاکانمان بۆ ساغ دەکەنەوە لەبری ئەرك و ماندوبونیانە لەساغکردنەوەی کاڵاکان و ئەمەیش وەك ئەو کرێیە وایە کە کۆمپانیاکان دەیدەنە ئەو بریکار و دەڵاڵانەیان کە کاڵاکانیان بۆ ساغ دەکەنەوە، ئیتر بۆچی کرێی دەڵاڵی و بریکاری حەڵاڵە و بەڵام ئەوەی ئێمە دەیدەینە بەشداربوەکانمان حەرامە لەکاتێکدا هیچ جیاوازییان نییە.

ئەم لێکچواندنەیش لە ڕوکەشدا ڕاستە بەڵام لە ناوەڕۆکدا هەڵەیە لەبەر ئەم خاڵانەی لای خوارەوە:

أ- لەگرێبەستی دەلاڵیدا دەلاڵەكان كاڵا ساغ دەكەنەوە و پارە وەردەگرن، بەڵام لەسیستەمی (Network Marketing) دا دەلاڵەكان دەبێت سەرەتا بۆ خۆیان كاڵا بكڕن و پارە بدەنە كۆمپانیا ئەگەر وا نەكەن مافی بەشداربوونی كارەكەیان پێ نادرێت.

ب- مەبەستی سەرەكی گرێبەستی دەلاڵی ساغكردنەوەی كاڵایە، بەڵام لەسیستەمی (Network Marketing) مەبەستی سەرەكی كۆمپانیا زۆركردنی ڕێژەی بەشداربووانە نەك ساغ كردنەوەی كاڵاكان.

ت- لەگرێبەستی دەلاڵیدا دەلاڵەكان هەرگیز زیانی پارە ناكەن و ئەگەر گریمان نەیانتوانی كاڵاكان ساغ بكەنەوە ئەوە كاڵاكان ڕادەستی كۆمپانیا دەكەنەوە و تەنها ماندوبوونەكەیان زەرەر دەكەن، بەڵام لەم سیستەمەدا كە دەلاڵەكان دەبێت خۆیان سەرەتا كاڵاكان بەنرخێكی زۆر گران بكڕن، ئەگەر نەیانتوانی قەناعەت بەخەڵكانی تر بكەن بێنە سیستەمەكەوە ئەو كات هەم پارە زەرەر دەكەن وهەم ڕەنج و ماندوبوونیشیان.

ث- لە گرێبەستی دەلاڵیدا دەلاڵەكان بەرامبەر ساغكردنەوەی هەر كاڵایەك پارە وەردەگرن بێ گوێدانە ئەوەی كەسی كڕیار كاڵاكە چۆن و بۆچی بەكار دەهێنێت، بەڵام لەسیستەمی (Network Marketing) دا بەفرۆشتنی كاڵایەك یان دووان پارە وەرناگرن بەڵكو دەبێت ڕێژەیەكی زۆر لەبەشداربوان لەڕێگەی ئەمانەوە بەشداری بكەن وپاشان بەلای ڕاست وچەپدا بەیەكسانی دابەش بن، ئەوجا پارە وەردەگرن، خۆ ئەگەر بەشداربوو لای ڕاستی بەهێز بوو بەڵام لاكەی دیكەی بەهێز نەبوو، چالاك نەبوو، نەی دەتوانی كاڵاكان ساغ بكاتەوە، ئەو كات كەسەكە پارە وەرناگرێت، چونكە پێویستە هەردوو باڵەكەی هاوسەنگ بێت، بۆیە زۆر جار بەم بیانووە مافی بەشدابووەكان دەخورێت و ماندووبونەكەیان بەهەدەر دەڕوات.

ج- لەسیستەمی دەلاڵیدا دەلاڵەكان تەنها كرێی ئەو كاڵایانە وەردەگرن كەخۆیان ساغیان كردۆتەوە بەڵام لەم جۆرە سیستەمەدا دەلاڵەكان كرێی كاری خۆیان و خەڵكانێكی تریش وەردەگرن كە ڕەنگە هەر ئاگایان لێیان نەبێت ونەشیان ناسن.

ح- لەگرێبەستی دەلاڵیدا نابێت دەلاڵەكان هیچ درۆو چەواشەكارییەك بكەن لەپێناو ساغكردنەوەی كاڵاكاندا، بەڵام لەم سیستەمەدا كاری دەلاڵەكان بریتییە لەچەواشەكاری و

پیاهەڵدانی درۆ بەشان و باڵی کاڵاکان و ئەو داهات و قازانجە وەهمیانەی کەڕەنگە یەك لەسەدی ئەو خەڵکە لەڕێی کۆمپانیاوە دەستی بکەوێت.

خ- لە سیستەمی دەلاڵیدا ساغکردنەوەی کاڵاکان چەقی مامەڵەکەن، بەڵام لەم جۆرە سیستەمەدا بەشداربوو خودی خۆی دەبێتە چەقی مامەڵەکە وکاڵاکان شتێکی لاوەکین، هەربۆیە کۆمپانیا زۆر گرنگی بەو کەسانە نادات کە کاڵاکان بەمەبەستی بەکارهێنان وسوود لێوەرگرتنی خۆیان دەکڕن چونکە دەزانێت بەو شێوەیە سیستەمەکەی ئەوان لاواز دەبێت و دەمرێت و ڕێژەی قازانجیشیان کەم دەبێتەوە، بۆیە ئەوان زیاتر گرنگی بەو کەسانە دەدەن کەبەمەبەستی بەشداریکردن لەسیستەمەکە کاڵاکان دەکڕن چونکە دەزانن هەریەك لەوانە لەبری کاڵایەك دەیەها و سەدەها کاڵا بۆ کۆمپانیا ساغ دەکەنەوە لەڕێگەی هێنانی بەشداربووی زیاتر بۆ کۆمپانیا.

کۆمپانیای (Qnet) خۆیشی دان بەو ڕاستییەدا دەنێت کە ڕێژەی ساغ بونەوەی کاڵاکانیان لە ڕێگەی ئەو کەسانەی مەبەستیانە کاڵاکان بکڕن لە (١٨٪) یە، بەڵام لەڕێگای ئەو کەسانەی کە بەمەبەستی بەشداربوون لەسیستەمەکە دەیکڕن (٨٢٪) ە. کەواتە (١٨٪)ی بەشداربووان کاڵاکەیان مەبەستە و (٨٢٪) یشیان سیستەمە بازرگانییەکەیان مەبەستە.

هەر بۆیە و لەبەر ئەو هۆکار و جیاوازییانەی سەرەوە بەهیچ شێوەیەك دروست نییە کاری کۆمپانیای (Qnet) یان هەر کۆمپانیایەکی تر کە بە سیستەمی (Network Marketing) کار دەکات بە دەلاڵی یان بریکاری بەراورد بکرێت.

٢- (الجعالة): جەعالە لە شەرعدا بریتییە لەوەی کەسێك خەڵاتێك دیاری بکات لەبەرامبەر کردنی کارێکدا، بەبێ ئەوەی کەسەکە دەستنیشان بکات یاخود مەرجێکی تایبەتی لەسەر دیاری بکات، بۆ نموونە: کەسێك شتێکی لێ وون بووە ودەڵێت هەرکەس بیدۆزێتەوە ئەوەندە خەڵاتی دەدەمێ، بیرۆکەی (الجعالة) بریتییە لەمە.

هەڵسوڕاوانی کۆمپانیا پۆنزییەکان هەندێك جار پەنا بۆ ئەوە دەبەن کە ئەو پارەیەی ئەوان دەیدەنە بەشداربووەکانیان جەعالەیە، ئەمەیش دیسان هەڵەیە و ڕاست نییە لەبەر ئەم جیاوازییانەی لای خوارەوە:

أ- لە جەعالەدا ئەو كەسەی بەكارەكە هەڵدەستێت كەسێكی دیاریكراو نییە، بەڵام لە سیستەمی (Network Marketing) دا كەسەكە دەبێت دیاری كراو بێت و سەرەتا گرێبەست لەگەڵ كۆمپانیا بكات و كاڵای لێبكڕێت.

ب- لە جەعالەدا ئەو كەسەی بەكارەكە هەڵدەسێت هیچ پارەیەك ناداتە كەسی خاوەن كار یان كۆمپانیاكەی و ئەگەر زەرەریشی كرد تەنها هەوڵ وماندووبونەكەی زەرەر دەكات، بەڵام لەم سیستەمەدا كەسەكە بڕێك پارە دەداتە كۆمپانیای خاوەن كار وئەگەر لەكارەكەیدا سەركەوتو نەبوو ئەوە جگە لەماندوبوونەكەی زیانی مادیش دەكات.

ت- لەجەعالەدا كەسەكە تەنها پارەی كار وماندوبوونی خۆی وەردەگرێت نەك كەسانی تر، بەڵام لەم سیستەمەدا كەسەكە پارەی ماندوبوونی خۆی وخەڵكانێكی تریش وەردەگرێت كەڕەنگە ئەم هەر نەیشیان ناسێت و ئاگایشی لێیان نەبێت.

كەواتە كاری ئەم كۆمپانیایانە لەگەڵ سیستەمی جەعالەیش یەك ناكاتەوە و جیاوازییان زۆرە.

٣- بەخشینی دیاری (الهبة):

دیاری: واتا بەخشینی شتێك بەكەسێك بەبێ بەرامبەر.

ئەمەیش یەكێكی ترە لەو جڵە پوشانەی كە هەڵسوڕاوانی كۆمپانیای (Qnet) وسەرجەم كۆمپانیا پۆنزییەكان دەیانەوێت خۆیانی پێ بگرنەوە و دەیانەوێت وای وێنا بكەن ئەو پارانەی دەیدەنە بەشداربووەكانیان بەخششێكی بێ بەرامبەرە؟!.

ئەمەیش دیسانەوە چەواشەكارییە؛ چونكە وەكو پێشتریش گوتمان دیاری دەبێت بەبێ بەرامبەر بێت، بەڵام پارەی كۆمپانیا پۆنزییەكان بێ بەرامبەر نییە بەڵكو بەشداربووەكان لەبەرامبەر ئەوەدا پارەیان دەست دەكەوێت كە نەك تەنها خۆیان بەڵكو دەبێت خەڵكانی تریش لەگەڵ خۆیان پەلكێش بكەن و قەناعەتیان پێبكەن كە كاڵاكانی ئەمان بكڕن ئەوجا كۆمپانیا ولەبەرامبەر ئەوانەدا پارەیان دەداتێ.

دەبا كەسێك كاڵا نەكڕێت لەكۆمپانیا بزانین كۆمپانیا یەك سەنتی دەداتێ؟ یان با بیشیكڕێت بەڵام بەشداربووی تر بۆ كۆمپانیا پەیدا نەكات هەر بزانین هیچی دەداتێ؟ بەدڵنیاییەوە نەخێر.

باشە ئەگەر گریشمان ئەوەی كۆمپانیا دەیداتە بەشدابووەكانی دیارییە: ئایا هەموو دیارییەك حەڵاڵە؟! بەدڵنیاییەوە نەخێر بۆنموونە ئەو دیارییەی قەرزدارێك دەیداتە خاوەن قەرز بۆ ئەوەی ماوەی قەرزەكەی بۆ درێژ بكاتەوە بەسوو ئەژمار دەكرێت نەك دیاری. یان ئەو دیارییەی هاوڵاتییەك دەیداتە كارمەندێكی حكومەت بۆ ڕایی كردنی كارەكانی بە بەرتیل ئەژمار دەكرێت نەك دیاری؛ بۆیە ئەگەر دیارییش بێت مەرج نییە دروست بێت، كە لەبنەڕەتدا دیاری نییە وناوزەندكردنی بەو ناوە چەواشەكارییە.

ئەمانە كۆمەڵێك قسەی بێ بنەما وناڕاستن ومەبەست لێیان شەرعاندنی كارەكەیانە نەك شەرعی بوونی.

بۆیە شێوازی كاری كۆمپانیای (Qnet) و هاوشێوەكانی ناچێتە ژێر ناوی هیچ جۆرە گرێبەستێكی شەرعی كە كاتی خۆی زانایان قسەیان لەبارەوە كردوە و ڕێگەیان پێداوە، هەر هەوڵێكیش لەو پێناوەدا بێسوودە و دەچێتە خانەی چەواشەكارییەوە[٢٨].

---

٢٨ – بۆ زانیاری زیاتر لەو بارەیەوە بڕوانە: د. حسين حسين شحاتة، بحث بعنوان الضوابط الشرعية للسمسرة والسماسرة، سلسلة بحوث ودراسات في الفكر الإقتصادي الإسلامي، د. غادة غالب يوسف صرصور، السمسرة بين الواقع والقانون دراسة مقارنة بين القانون التجاري المصري والقانون التجاري الأردني. البنك الإسلامي للتنمية، المعهد الإسلامي للبحوث والتدريب، الجعالة والإستصناع، القاضي ، عبد الله بن إبراهيم بن علي، التطبيقات المعاصرة للجعالة و أحكامها في الفقه الإسلامي. أحمد ياسين القرالة، حكم الهبة وموانع الرجوع فيها في الفقه الإسلامي، مجلة الدراسات، علوم الشريعة والقانون، ج٣٢،ع١، ٢٠٠٥.

## تەوەری چوارەم
## حوكمی شەرعیی بەشداریكردنی لە كۆمپانیای (Qnet) وهاوشێوەكانی

بنەما لەسەر ئەو تەوەرانەی پێشتر باسمان كرد دەربارەی كاری كۆمپانیای (Qnet) وهاوشێوەكانی و پاش بەدواداچوونێكی زۆر و گەڕان و هەڵسەنگاندن بۆ شێوازی كارەكەیان و لێكەوتە خراپەكانی و بەراورد كردنی بە هەڵسوكەوت و گرێبەستە شەرعییە ڕێگەپێدراو یاساغەكان و لێكۆڵینەوە لە بۆچوونی زانایانی هاوچەرخ و بەڵگەكانیان لەو بارەیەوە، قەناعەتی تەواوم هەیە بەوەی كە كاركردن لە گەڵ كۆمپانیای (Qnet) و (QuestNet)، (GoldQuest)، (Seven Diamonds)، (Forever)، (DXN) و هاوشێوەكانییان وهەر كۆمپانیایەكی تریش كە بە سیستەمی پۆنزی (Network Marketing) كار بكات و ساغكرنەوەی كاڵاكانییان حەرامە و دروست نییە و هەر داهاتێكیش لەو جۆرە كارانە پەیدا بێت دیسانەوە حەرامە و دروست نییە.

ئەمەیش تەنها بڕیاری من نییە بەڵكو بڕیاری زۆرینەی هەرە زۆری كۆمكارە فیقهی وناوەندەكانی توێژینەوە وفەتوا و كەسایەتییە خاوەن سەنگەكانی ئەو بوارەن لە جیهانی ئیسلامیدا.

بەڵگەیشم بۆ پشتڕاستكردنەوەی ئەم بۆچوونەم زۆرن و پێشتر ئاماژەم بەهەندێكیان كردوە و لێرەدا ئاماژە بەهەندێكی تریان دەكەم كە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- سوو خۆری: هەرچەندە كۆمپانیاكانی بواری (Network Marketing) بەئاشكرا باسی سوو ناكەن ومامەڵەی پێوە ناكەن، بەڵام لەناواخندا شێوازێك لەشێوازەكانی سوو پەیڕەو دەكەن؛ چونكە وەك لە پێشەكییەكەیشدا باسمكردووە كاڵاكان تەنها ئامڕازن و كۆمپانیاكان بۆ خۆدزینەوە لەیاساكان وحوكمە شەرعییەكان بەكاریان دەهێنن. هەر بۆیە بەكاربەرانی كۆمپانیا لە كاتی هەوڵدان بۆ هێنانی خەڵكانی تر بۆ ناو سیستەمەكە ئەوەندەی باسی قازانجە وەهمییەكانی كۆمپانیایان بۆ دەكەن نیو ئەوەندە باسی كوالیتی كاڵاكانییان بۆ ناكەن و كەسەكان خۆیشیان زۆر مەبەستییان نییە بزانن، چونكە هەموویان دەزانن هیچ كات

کاڵاکان مەبەست و ئامانجی گرێبەستەکە نین. کەواتە شێوازی ڕاستەقینە و ناوەڕۆکی مامەڵەکە ئەوەیە کەتۆ پارەیەك دەدەیت و دواتر زیاتر وەردەگریتەوە، ئەمەیش دووجۆری سوو دروست دەکات، یەکەمیان سووی دواکەوتنی یەکێك لەدراوەکانە (ربا النسيئة)؛ چونکە تۆ پارەیەك دەگۆڕیتەوە بە پارەیەك و بەڵام لەکاتی گرێبستەکەدا پارەی لایەنی دووەم ئامادە نییە بەڵکو دواتر وەریدەگریتەوە، دووەمیشیان سووی زیاد و کەمی دراوەکەیە (ربا الفضل) کەتۆ پارەیەك دەگۆڕیتەوە بەپارەیەکی تر و دواتر لەبەرامبەردا زیاتر وەردەگریتەوە.

٢- ئەم کارە فێڵ و درۆ و چاوبەست و چەواشەکاری زۆری تێدایە لەزۆر ڕووەوە لەوانە: نرخی کاڵاکان، کوالیتییەکەیان، نەبوونی هیچ گرەنتییەکی شەرعی و یاسایی بۆ پاراستنی مافی بەشداربووەکان، ئەو بەڵێنە گەورانەی کە کۆمپانیا بەبەشداربووانی دەدات بەوەی قازانجێکی بێ شومار دەکەن و دەبنە خاوەن سەرمایەی خۆیان، خۆ ئەگەر ئەم بەڵێنانە بۆ کەمینەیەکی زۆر کەم ڕاست بێت ئەوە بۆ زۆرینەی بەشداربووان درۆیە و چەواشەکارییە.

٣- کاری ئەم کۆمپانیایانە جۆرێك لە قومار و موجازەفەی تێدایە و داهاتویەکی پڕ مەترسییان هەیە: ئەمەیش بەهۆی ئەوەی کە ئەم جۆرە سیستەمی کارکردنە پاش ماوەیەك قفڵ دەبێت و کۆمپانیا مایە پوچی خۆی ڕادەگەیەنێت و سەرمایەکەی لەلایەن خەڵکانێکی نەناسراوەوە دەستی بەسەردا دەگیرێت و ون دەکرێت.

چونکە وەکو گوتمان کۆمپانیا یەك سەنتی داهاتی خۆی ناداتە بەشداربووەکان بەڵکو لە پارەی بەشداربووانی نوێ پارەی بەشداربووە کۆنەکان دەدات بۆیە کۆمپانیا دەبێت بەردەوام بەشوێن بازاڕی تازە و بەشداربووی نوێدا بگەڕێت چونکە ئەگەر کارەکە لەقۆناغێکی دیاریکراودا وەستا و وەك پێویست بەشداربووی نوێ نەهاتە ناو کارەکەوە ئەو کات کۆمپانیا ناتوانێت شایستە داراییەکانی بەشداربووانی بدات بۆیە ناچار دەبێت مایەپوچی خۆی ڕابگەیەنێت و ئەزموونی پێشووی ئەو جۆرە کۆمپانیایانە لە کوردستان و جیهان سەلمێنەری ئەو ڕاستییەن.

هەر بۆیەیشە کۆمپانیا بەشداربووەکانی ناچار دەکات کەدەبێت ناوبەناو کاڵای تازە بکڕنەوە وبەشدارییەکەیان نوێ بکەنەوە تا سیستەمەکە بەردەوام لەگەڕاندا بێت وداهاتیش بەردەوام بێت.

٤- ئەم جۆرە كۆمپانیایانە زیان بە ئابووری نەتەوەیی ونیشتیمانی دەگەیەنن و مەترسی لەسەر دروست دەكەن، ئەمیش لەچەند ڕوویەكەوە كە گرنگترینیان ئەم دووانەن:

أ- ئەم سیستەمە وزەو توانای خەڵكی بەگشتی ولاوان بەتایبەتی دەكوژێت و ئیفلیجی دەكات و هەموو گەنجەكان لە گەنجێكی وەبەرهێن دەكاتە گەنجێكی بەكاربەر، یەك گەنج بەم سیستەمە توانای وەبەرهێنانی نامێنێت و هەموویان دەبنە مشەخۆر بەسەر داهاتی یەكترەوە و پشكی شێری ئەو داهاتانەیش كۆمپانیا دەیبات. باشە با بیهێنینە پێش چاوی خۆمان ئەگەر هەموو گەنجی ئەم وڵاتە بوونە كارمەند و بەشداربووی كۆمپانیای (Qnet) وهاوشێوەكانی، ئەوكات بیهێنە پێش چاوی خۆت چ كارەساتێك لەم وڵاتەدا ڕو دەدات.

ب- سیستەمی كاری ئەم كۆمپانیایانە هەموو كەرتە ئابوری و زانستی و پیشەسازی و كشتوكاڵی و سەربازی و ڕۆشنبیری و وەبەرهێنەكان پەك دەخات چونكە هەموو كار و كەسابەتمان دەبێتە ساغكردنەوەی كۆمەڵێك كاڵا كە هیچیان بەرهەمی نیشتمانی نین و بەنرخی چەند قات لەخۆی زیاتر ساغ دەكرێنەوە و داهاتەكانیشیان هەناردەی كۆمەڵێك بانك و ژمارە حیسابی ئاڵۆز و تەمومژاوی دەكرێت.

٥- ئەم جۆرە كۆمپانیایانە سەر بەهیچ دەوڵەتێك یان دامەزراوەیەكی دارایی خاوەن سەنگ وباوەڕپێكراو نین و دوورن لەهەموو چاودێرییەكی شەرعی و یاسایی و دارایی، ئەمەیش مافی بەشداربووان دەخاتە مەترسییەوە، چونكە لەكاتی ڕوودانی هەر كێشەیەك بەشداربوو ناتوانێت وناشزانێت سكاڵا لەسەر كێ تۆمار بكات و هانا بۆ كێ و بۆ كوێ بەرێت.

٦- خواردنی ماڵی خەڵكی بە ناحەق: كۆمپانیا بۆ ئەوەی مافی بەشداربوون بۆ ساغكردنەوەی كاڵاكان بداتە هەر كەس ناچاری دەكات كاڵایەكی لێ بكڕێت بەزیاتر لە نرخی هاوشێوەكانی خۆی، لەكاتێكدا نەپێویستیان پێیەتی نەحەزیان لێیەتی بەڵام ناچارن بیكڕن بۆ ئەوەی مافی بەشداربوونیان لەسیستەمەكە پێبدرێت. ئەمەیش جۆرێكە لەجۆرەكانی خواردنی ماڵی خەڵكی بەناحەق.

كەواتە مامەڵە كردن لەگەڵ ئەم كۆمپانیایانە: (سوو، قومار، فێڵ، فریودان، مەترسی، ناڕونی، زیانی گشتی، خواردنی ماڵی خەڵكی بە ناحەق) تێدایە و هەریەك لەمانەیش بەتەنیا

بەسن بۆ حەرامكردنی هەر مامەڵەیەك، خۆ ئەگەر هەموویان پێكەوە كۆبوونەوە لەیەك مامەڵەدا ئەوە بەدڵنیاییەوە حەرامییەكەی توندتر و سەخت ترە.

## تەوەری پێنجەم
## بۆچوونی زانایان دەربارەی كاری كۆمپانیاكانی
## (Network Marketing)

زۆرێكن ئەو زانا و كەسایەتی و لیژنە و نێوەندە شەرعییانەی كە بە ئاشكرا فەتوایان داوە لەسەر حەرامی كاری كۆمپانیای (Qnet) و هاوشێوەكانی لە نموونەی: (Forever) (DXN) وە من لێرەدا و لەبەر كەمی كات و شوێن تەنها بەشێكی ئەو فەتوایانە وەك نموونە دەگوازمەوە لەوانە:

لیژنەی هەمیشەیی فەتوا وتوێژینەوەی زانستی سعودی لەوەڵامی پرسیارێكدا دەربارەی كار كردن لەگەڵ ئەم جۆرە كۆمپانیایانەدا دەڵێت: (ئەم جۆرە مامەڵانە حەرامە چونكە مەبەستی سەرەكی مامەڵەكە كڕینی كاڵا و بەرهەمەكان نییە بەڵكو ئەو بڕە پارەیەیە كەبەشداربوو لە بەشداریكردنی سیستەمەكە و هێنانی خەڵكانی تر دەستی دەكەوێت...هەر بۆیە ئەو جۆرە كۆمپانیایانە لە كاتی بانگەشەكردنیان بۆ كاڵاكانیان زیاتر باسی ئەو قازانجە زەق دەكەنەوە كەدەكرێت كەسی بەشداربوو لەڕێی بەشداری پێكردنی كەسانی ترەوە دەستی بكەوێت وبەوە هەڵی دەنێن كە دەكرێت قازانجێكی زۆر بەدەست بێنێت بەراورد بەنرخی كاڵاكە كەشتێكی كەمە، بۆیە ئەو كاڵایانەی ئەم جۆرە كۆمپانیایانە بانگەشەی بۆ دەكەن تەنها ئامرازێكە و مەبەست لێی پەردەپۆشكردنی ئەو قازانج و داهاتەیە كەلەسیستەمەكەوە دەست دەكەوێت، هەربۆیە ئەم جۆرە مامەڵەیە حەرامە و دروست نییە)[٢٩].

---

٢٩ - لیژنەی هەمیشەیی فەتوا وتوێژینەوەی زانستی سعودی، فەتوای ژمارە: (٢٢٩٣٥)، بەرواری ١٤٢٥/٣/١٤هـ.

لیژنەی فەتوای میسر پاش لێکۆڵینەوە و بەدواداچونێکی زۆر لەوەڵامی پرسیارێکدا دەربارەی کاری ئەو کۆمپانیایانەی کە بەسیستەمی تۆڕبەندی بازرگانی (التسويق الشبكی) کار دەکەن دەڵێت:

(ئەم مامەڵەیە بەو شێوەیەی پرسیاری لەبارەوە کراوە لەڕوی شەرعەوە حەرامە ودروست نییە.. بەتایبەت پاش ئەوەی بۆ شارەزایان دەرکەوتووە کە بڵاوبوونەوەی ئەم جۆرە سیستەمی بازاڕکردنە سیستەمی بازاڕکردنی ئاسایی تێك دەدات کە سیستەمێکی فرەڕەهەندە وپشت بەچەندین ئامراز دەبەستێت، لەهەمان کاتدا سیستەمێکی جێگرەوەی تۆکمە و ڕێکوپێك دانامەزرێنێت. هەروەها دەرکەوتووە کەئەم سیستەمە پاڵ بە بەشدابووەکانێوە دەنێت لەپێناو کردنەوەی بازاڕ بۆ کاڵاکانیان پەنا بۆ هەندێك کاری دوور لەڕەوشت ببەن لەنموونەی درۆ یان چەندین هۆکاری تری سەرنج ڕاکێشان کە لەوانەیە کەسی بەرامبەر بەهەڵەدا ببات و ئیرادەی بخاتە ژێر پرسیارەوە، وەك زەفکردنەوە و جەخت کردن لەسەر ئەو داهاتەی کە ڕەنگە لەڕێی ئەم سیستەمەوە دەستی بکەوێت بێ گوێدانە باسکردنی خودی کاڵاکە کە مەبەستی سەرەکی مامەڵەکەیە، پێشتریش ئەمینداریێتی لیژنەکە لەفەتوایەکی پێشویدا هۆشداری دابوو بەوەی بنبڕکردنی ئەم جۆرە دیاردانە مەرجە بۆ حەڵاڵکردنی مامەڵەکە، بەڵام بەهەڵە تێگەیشتنێك دروستبوو بەهۆی نەگەڕانەوە بۆ مەرجەکان.

بۆیە ئەمینداریێتی فەتوا پاش بەدواداچوون ولێکۆڵینەوە بۆی دەرکەوتووە کە ئەم جۆرە مامەڵانە کۆمەڵێك خاڵی مەترسیداری تێدایە ڕێگرە لەحەڵاڵبوونی، هەر ئەمەیش وای کردووە کەبەڕوونی و بە ئاشکرا فەتوای حەرامبوونی بدات بۆیە بەهیچ شێوەیەك مامەڵە کردن لەگەڵیان دروست نییە)[٣٠].

وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی وڵاتی کوەیت لەفەتوایەکیدا لە وبارەیەوە دەڵێت: (بازاڕگەری تۆڕبەندی بەهەموو شێوەکانییەوە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامییە ودروست نییە کاری پێ بکرێت)[٣١].

---

٣٠ - لیژنەی فەتوای میسر- ژمارەی فەتوا: ٤٨٣- بەروار: ٢٠١١/٩/١٢.

٣١ - وەزارەتی ئەوقاف وکاروباری ئیسلامی- ژمارەی فەتوا (١٣٦٠٥) بەروار: ٢٠١١/١٢/٢٦.

**کۆمکاری فیقهی ئیسلامی سودانیش لەفەتوایەکیدا دەربارەی کۆمپانیاکانی بازاڕگەری تۆڕبەندی دەڵێت: (بەشداریکردن لەکۆمپانیای (بزناس) و هاوشێوەکانی لەکۆمپانیاکانی بازاڕگەری تۆڕبەندی دروست نییە وحەرامە چونکە قومارە، وە سیستەمی کاری کۆمپانیای بزناس و هاوشێوەکانی لەکۆمپانیاکانی بازاڕگەری تۆڕبەندی هیچ پەیوەندییەکی بەگرێبەستی دەڵاڵییەوە نییە...هەر بۆیە کۆمکار داوا دەکات لەهەموو ئەو لایەنانەی کە ڕێگەیان بەکاری ئەم جۆرە کۆمپانیایانە داوە ڕێگەپێدانەکانیان هەڵبەوەشێننەوە و پێش گەڕانە بۆ بۆچونی کۆمکار مۆڵەت بەهیچ جۆرە کۆمپانیایەکی بازاڕگەری تۆڕبەندی نەدرێت)[٣٢].**

**ئەنجومەنی باڵای فەتوای فەلەستینیش لەو بارەیەوە دەڵێت: (ئەنجومەنی باڵای فەتوا لەدانیشتنی ژمارە (٧٩) یدا لەبەرواری (٢٠١٠/٣/١٨) لەو دۆسیەیەی کۆڵییەوە و پاش گفتوگۆکردن لەو بارەیەوە بۆی دەرکەوت... کەزۆرینەی زۆری زانایانی هاوچەرخ پێیان وایە مامەڵە کردن لەگەڵ ئەم جۆرە کۆمپانیایانەدا حەرامە، چونکە ناوەڕۆکی مامەڵەکردنی بازاڕگەری تۆڕبەندی خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە کەسێك پارەیەك بگۆڕێتە بەپارەیەکی تر بەنرخێکی زیاتر و ئەمەیش لەشەرعدا بەسوو ئەژمار دەکرێت و بەپێی دەقی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر حەرامە، ئەمە جگە لەوەی کە- کاری ئەم کۆمپانیایانە- لەهەندێك ڕووەوە لەگەڵ قومار و فریودان و مامەڵە نادیارەکان یەك دەکاتەوە...چونکە ئەو کاڵایەی کە بەرِوکەش کۆمپانیا بازرگانی پێوە دەکات تەنها ئامرازێکە بۆ گەیشتن بەقازانج و داهاتی بەشداریکردن، کەواتە لەبەر ئەوەی ئەمە رووی ڕاستەقینەی کارەکەیە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم جۆرە کۆمپانیایانە حەرامە)[٣٣].**

**ئەنجومەنی باڵای فتوای ئوردونیش لەو بارەیەوە دەڵێت: (شێوازی کاری بازاڕگەری تۆڕبەندی و وەرگرتنی پارە لەبەرامبەر بەشداریکردن تێیدا ناچێتە خانەی دەڵاڵی شەرعییەوە، بەڵکو دەچێتە خانەی قومارەوە کەلەشەرعدا قەدەغە کراوە)[٣٤].**

---

٣٢ - کۆمکاری فیقهی ئیسلامی- دانیشتنی ژمارە (٢٤/٣) بەرواری (٢٠٠٣/٦/١٧).

٣٣ - لیژنەی فەتوای فەلەستینی- ژمارەی فەتوا: ٣٩٣.

٣٤ - ئەنجومەنی باڵای فەتوای ئوردون- ژمارەی فەتوا (٦٤٤) بەرواری: ٢٠١٠/٤/٢٢.

دکتۆر عەلی قەرەداغیش ئەمینداری گشتی یەکێتی زانایانی جیهانی ئیسلامی لەو بارەیەوە دەڵێت: (لەچەند ساڵی پێشودا ئێمە فەتوامان داوە و زۆرێك لەزانایانی هاوچەرخیش هەمان فەتوایان داوە بەحەرامی و یاساغی هەر مامەڵەیەك کەپشت بە بازارگەری تۆڕبەندی (التسويق الشبكى) ببەستێت، چونکە درۆ و ناڕوونی و وفێڵ و مەرتسی زۆری تێدایە وە هیچ سوودێکی بۆ کۆمەڵگە نییە)[٣٥].

جگە لەم کۆمکار و لیژنە و زانایانەیش سەرجەم شارەزایانی بواری ئابووری ئیسلامی و کەسایەتییە دیارەکانی ئەو بوارە فەتوای حەرامی مامەڵەکردنیان لەگەڵ ئەو جۆرە کۆمپانیایانە داوە لەوانە: (د. عەلی جومعە موفتی میسر، د. محمد راتب نابولسی، د. صديق ئەمین زەریر، د. عبد الحي يوسف، .. ) ئەوانە وسەدانی تریش دەڵێن حەرامە[٣٦].

لەبەرامبەر ئەماندا لەوانەیە خەڵکانێك هەبن گوتبێتیان دروستە ئەویش یان بەهۆی کەمی پاشخانی زانستیانەوە بووە بۆیە کە هەر لێی تێنەگەیشتون، یاخود کەوتونەتە ژێر کاریگەری ئەو درۆ وجوانکاری و چەواشەکارییانەی کە کۆمپانیا بۆ کارەکەی دەکات یاخود هەندێك جار بەمەرج گوتویانە دروستە بەڵام کۆمپانیا بەمەبەستی چەواشەکاری باسی مەرجەکان ناکات و فەتواکە پەرت دەکات و تەنها ئەو بڕگەیەی باس دەکات کە گوتراوە دروستە.

بۆیە پێویستە بەشداربووانی بەڕێزی کۆمپانیای (Qnet) وهاوشێوەکانی بەوورد بەخۆیان و کارەکەیاندا بچنەوە، چونکە ئەوان تاوانی حەرامی کارەکەیان تەنها بەخۆیانەوە ناوەستێت بەڵکو لەتاوانی هەموو ئەکەسانەیش بەرپرسیارن کەبەهۆی ئەمانەوە بەشداری دەکەن و چۆن لەدنیا بەشێك لەداهاتەکانیان دەبەن لەقیامەتیش بەشێك لەتاوانەکانیان هەڵدەگرن.

---

٣٥ - دیمانەیەك لەگەڵ ڕۆژنامەی (العرب) ی قەتەری ژمارە: (١٠٨٠١) لە ٧/يناير/٢٠١٨.

٣٦ - مقال بعنوان: العلماء يؤكدون حرمة التعامل معها- شركات التسويق الشبكي توقع الشباب في شرك وهم الثراء https://www.al-forqan.net/articles/٤٣١.html.

## تەوەری شەشەم:
## بۆچوونی لیژنەی باڵای فەتوای هەرێم دەربارەی کۆمپانیای (Qnet) و سیستەمی (Network Marketing)

هەرچەندە لیژنەی باڵای فەتوای هەرێم یەکێکە لەو نێوەندە زانستی و شەرعییانەی کە بۆ دواجار فەتوای حەرامی کاری کۆمپانیای (Qnet) و سیستەمی تۆڕبەندی بازرگانی دەرکرد، بەڵام ئەم فەتوایە بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕی و هەندێك ئاڵۆزی و گومانی لەسەر درووستبوو، بۆیە پێم خۆشبوو بەوردی قسەی لەسەر بکەین و تەوەرێکی تایبەتی بۆ تەرخان بکەین تا وەڵامی ئەو ئاڵۆزی و گومانانەی سەر هەڵوێستی لیژنەکە بدەینەوە.

سەرەتا پێم خۆشە بگەڕێینەوە چەند ساڵێك لەمەوبەر ووورد تر بۆ ساڵی (٢٠١٥) کاتێك کۆمپانیای مێگا هۆڵدینگ دەستی بەکارەکانی کرد وبەهەمان سیستەمی تۆڕبەندی بازرگانی (Qnet) خەڵکێکی زۆری لەخۆی کۆکردەوە و بەناوی فرۆشتن و بەکرێدانی سایتی ئەنتەرنێتەوە کەوتنە دەستبڕینی خەڵك و توانییان بەزمانی لوس و قسەی بریقەدار هەندێك بەناو زانا لەخشتە بەرن و فەتوایان بۆ دان کە کارەکەیان حەڵاڵە.

کاتێك هاتنە لای بەندە گوتم کارکردن بەو جۆرە سیستەمە حەرامە و لەزنجیرە باسی (دیاردەی سوو لەمامەڵە هاوچەخەکاندا) کە لەکەناڵی ئاسمانی پەیامەوە پەخش دەکرا بەزەقی باسم لەخۆیان وحەرامی کارەکەیان کرد، کەبیستیان شتێکی وا بەڕێوەیە وکاریگەری خراپی لەسەریان دەبێت بەر لەپەخش کردنی بەرنامەکە کۆمەڵێك گەنجی چەواشەکراویان ناردە سەرکەناڵەکە و هەڕەشەی تۆمارکردنی سکاڵای یاساییان کردبوو ئەگەر بەرنامەکە پەخش بکرێت، ئەوکات برای بەڕێزم و بەڕێوبەری کەناڵەکە (کاك حاجی فاروق) پەیوەندی پێوە کردم و ئاگاداری کردمەوە کە شتێکی وا هەیە، منیش بەڕوونی عەرزم کرد کەدەبێت بەرنامەکە وەك خۆی وبێ هیچ دەستکارییەك پەخش بکرێت ومنیش خۆم بەپرسیارم لەقسەکانم و لەگشت لێکەوتەکانی بەرنامەکە وهەرچیشیان گوت بلێ بۆچوونی دکتۆر خۆیەتی وخۆی بەرپرسیارە، ئەوەبوو بەسوپاسەوە کەناڵەکە بەرنامەکەیان وەك خۆیان دابەزاند و بڵاوبوونەوەی بابەتەکە گورزێکی خراپی لێدان و من لەبەشێکی قسەکانمدا لەسەر کۆمپانیای

ناوبراو گوتبووم: (.... ئێستا هەندێك كۆمپانیا پەیدا بوون وێب سایت بەكرێ دەدەن بەنرخێكی گرانتر لەبازاڕ و ئەو كەسانەی بەشدارییان لەگەڵ دەكەن زۆر بەدەگمەن وێبسایتەكان بۆ كاری تایبەتی خۆیان بەكار دەهێنن؛ چونكە ئەگەر مەبەستیان ئەوە بێت وێبسایتی تاكە كەسی بۆ خۆیان دابنێن، ئەوە زۆر هەرزانتر وێبسایتیان دەست دەكەوێت، بەڵكو مەبەستیان بازرگانی كردنە لەو ڕێگایەوە...... هۆكاری حەرامبوونەكەیشی یەك شت نیە بەڵكو لەچەند ڕوویەكەوەیە لەوانە: بوونی قومار، سوو بەهەردوو جۆرەكەیەوە، درۆ كردن وچاوبەست كردن، نادیاری چارەنووسی بازرگانییەكە، بەفیڕۆدانی سامانی تایبەت و گشتی وولات، ئەمانە و چەندین هۆكاری تر، كەهەر یەكێكیان بەسە بۆ حەرامكردنی كارەكە، نەك هەموویان پێكەوە....بۆیە داواكارم لە لاوان و گەنجان خۆیان بەم جۆرە كارانەوە سەرقاڵ نەكەن، چونكە جگە لەحەرامخۆری و تەمەڵی و بێكاری، شتێكی تری لێ ناپێچنەوە، ئەمەیش یەكەم كۆمپانیا نییە لەكوردستاندا بەم شێوەیە دەستی خەڵكی دەبڕێت، بەڵكو زۆر كۆمپانیای تر كاری لەم جۆرەیان كردوە، وهەموویشیان بێ ئەنجام بوون).

دواتر و بۆ زیاتر دڵنیاكردنی خەڵكی و ئاگاداركردنەوەیان لەمەترسی كاری كۆمپانیای مێگا هۆڵدین و هاوشێوەكانی بەندە نوسراوێكم بۆ لیژنەی باڵای فەتوای هەرێم بەرز كردەوە و داوای بۆچوونی بەڕێزیانم كرد لەو بارەیەوە كە ئەمە دەقەكەیەتی:

بسم الله الرحمن الرحيم

بەڕێزان: لیژنەی باڵای فەتوای هەرێمی كوردستان. لەگەڵ ڕێزدا.

كۆمپانیای (مێگا هۆڵدین) یەكێكە لەو كۆمپانیایانەی كە لە بواری (التسويق الشبكي) دا كار دەكەن و تەنها كاڵاكەیان جیاوازە لە كۆمپانیاكانی پێشوو ی وەك (بزناس) و (گۆڵدكویست) و هاوشێوەكانی.

مەرجی بەشداری كردن لەكار وچالاكیەكانی ئەم كۆمپانیایەدا ئەوەیە كەدەبێت بەشداربوو هەستێت بە بەكرێگرتنی وێب سایتێك لێیان بۆ ماوەی (٣) ساڵ بە بڕی (٧٥٠) دۆلار. دواتر بەشدار بوو دەتوانێت خوازیاری تر بۆ كۆمپانیا پەیدا بكات و ئەوانیش دەبێت بەهەمان شێوەی ئەم وێب سایت بەكرێ بگرن بەهەمان نرخ و بۆ هەمان ماوە و هەركاتێك

توانی شەش كەسی تر قەناعەت پێبكات سیان لەلای ڕاستی و سیان لەلای چەپی ئەو كات بەشێك لەو پارەیەی ئەوان دەیدەنە كۆمپانیا، كۆمپانیا دەیداتە ئەم بەشداربووەی كە ئەوانی قەناعەت پێ كردوە بەشداری بكەن لەكڕینی كاڵاكەدا.

وەبۆ زانیاری بەڕێزتان هیچ بەشداربوویەك بەمەبەستی كڕینی خودی كاڵاكە بەشداری ناكات، بەڵكو بەمەبەستی بەكارهێنانی وەك كارێكی بازرگانی، چونكە نرخی كاڵاكە لە بازاڕدا دەهێندەی هاوشێوەكانی خۆیەتی و بگرە زیاتریشە، هەر بۆ نموونە سایتی ترهەیە هەمان مواسەفاتی سایتەكەی ئەمانی تێدایە و نرخیشی زۆر لەو هەرزانترە و مواسەفاتیشی لەهەندێك ڕووەوە لەوەی ئەوان زیاترە. كۆمپانیا هەیە وێب سایتت دەداتێ بۆ ماوەی سێ ساڵ تەنها بە (٧١) دۆلار و ئەگەر مواسەفاتیشی زۆر باش بێت نرخەكەی دەگاتە (١٠٧) دۆلار و زیاتر نییە.

ئەوان بانگەشەی ئەوە دەكەن كە وێب سایتەكەیان فێری دیزاینت دەكات، لەكاتێكدا ئەو دیزاینەی ئەوان باسی دەكەن دیزاینێكی تایبەت و سەردەمییانە نییە وەك ئەو وێب سایتانەی تر كە پێویستە بە زمانەكانی سایت چنی (**Web Design**) ی (**PHP or ASP.Net**) بكرێت، بەڵكو چەند قاڵبێكی حازریان هەیە كە بە زمانە سادەكانی وەك (**HTML**)

دروستکراون کە چەندین ساڵە ئەم پرۆگرامی دروستکردنی وێب سایتە باوی نەماوە؛ چونکە توانای دروستکردنی سایتی داینامیکی نییە و ناتوانێت لەگەڵ داتا بەیس پەیوەندی بکات.

یان بانگەشەی هەندێك شتی تر دەکەن کە بەشداربوو هیچ ئیشی پێی نییە وتاقیکردنەوەی مەحاڵە و ناشتوانێت لێی دڵنیابێتەوە کە ڕاستە وایە یان نا، بۆیە تەنها قسەو ریکلامێکی بازرگانییە و هیچی تر. بۆ نموونە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ( Unlimited Bandwidth, Email and Traffic ) بێ سنوورە.

ئەم کۆمپانیایانە سەرجەمیان شێوازی کارکردنیان یەکە و بەڵام بۆ خۆڵکردنە چاوی خەڵك و خۆدزینەوە لە یاساکان ناو بەناو کاڵاکانیان دەگۆڕن.

زیانی گەورەی ئەم کۆمپانیایانە لەوەدایە کە ئەمانە داهاتی ئەو وڵاتانەی کاری تێدا دەکەن بەهەدەر دەدەن و تاڵانی دەکەن و ساڵانە بەمەلایین دۆلاری ئەو وڵاتە ڕەوانەی حسابی کۆمپانیا دەکرێت، بەبێ ئەوەی کەمترین سوودی هەبێت و بچوکترین خزمەت بەهیچ لایەنێکی ئەو وڵاتە یان دانیشتوانەکەی بکات، بگرە بەپێچەوانەوە گەنجەکانی فێری تەمەڵی و بێکاری و دانیشتن دەکات.

هەر بۆ زانیاری بەڕێزتان: زۆربەی دامەزراوە فیقهییە بەناوبانگەکانی جیهان فەتوایان داوە کە کاری ئەم کۆمپانیایانە حەرامە و لەژێر ناوی (التسويق الشبكي) دا پۆلێنیان دەکەن، و ئێمە دەقی فەتواکانی ئەو دامەزراوانە و هۆکاری قەدەغەکردنیشیان دەخەینە بەردەستی بەڕێزتان.

بۆیە تکامان وایە بەڕێزیشتان هەرچی زووە بڕیاری خۆتان لەسەر کاری ئەم جۆرە کۆمپانیایانە بدەن، چونکە ئەمان ڕۆژانە خەڵکانێکی زۆر لەگەنجی ئەم میللەتە چەواشە دەکەن و پارەکانیان ڕەوانەی کۆمپانیا بیانییە نەناسراوەکان دەکەن.

خوای گەورە پاداشتی خێرتان بداتەوە وکارەکانتان بخاتە تەرازووی چاکەکانتان و هەر کاتێکیش هەر ڕوونکردنەوەیەکی زیاترتان پێویست بوو خەڵکانی پسپۆڕ هەن کە ڕوونکردنەوە زیاترتان عەرز بکەن، لەگەڵ ڕێزدا.

پاش ماوەیەك و لەبەرواری (٢٠١٥/١/٢٧) بەڕێزیان بەسوپاسەوە بەڕوونی فەتوای حەرامی کاری کۆمپانیای (مێگا هۆڵدین) و هاوشێوەکانییان دا و هۆکارەکانی بڕیارەکەیشیان لەفەتواکەدا خستەڕوو و ئەمەیش دەقی فەتواکەیانە:

**فەتوای شەرعی دەربارەی بەشداری کردن لە کۆمپانیای (مێگاهۆڵدین)**

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

پرسیارێکی شەرعی ئاراستەی لیژنەی باڵای فەتوای هەرێمی کوردستان کرا، سەبارەت بە زانینی حوکمی شەرعی دەربارەی بەشداریکردن لە کۆمپانیای ( مێگاهۆڵدین) کە یەکێکە لەو کۆمپانیایانەی لە بواری (التسويق الشبكي) دا لە رێگەی ئەنتەرنێتەوە کڕین و فرۆشتن دەکەن؟

وەڵام: لیژنەی باڵای فەتوا پاش لێکۆڵینەوەو تاوتوێ کردنی ئەم بابەتە و بە سوود وەرگرتن لە ڕای زانایانی فیقهی ئیسلامی، لە کۆبونەوەی رۆژی (٢٠١٥/١/٢٧) بە ڕای زۆرینەی ئەندامەکانی ئەم بڕیارەی خوارەوەی دا:

دوایی لێکۆلینەوە و بەدواداچوون بۆمان دەرکەوت کە جۆری کڕین و فرۆشتنەکە بەم شێوەیەیە:

کە بەشدار بوو هەڵدەستێت بە بەکرێگرتنی وێب سایتێك لە کۆمپانیاکە بۆ ماوەی (٣) ساڵ بە بری (٧٥٠) دۆلار، دواتر پێویستە بەشداربوو خەڵکی خوازیاری تر بۆ کۆمپانیا پەیدا بکات و ئەوانیش دەبێت بە هەمان شێوەی ئەم وێب سایتە بەکرێ بگرن و بەهەمان نرخ بۆ ماوەی (٣) ساڵ و هەر کاتێك کەسی یەکەم توانی شەش کەسی تر قەناعەت پێبکات و بەشداری ئەم کڕین و فرۆشتنە بکەن، ئەو کات کۆمپانیاکە بەشێك لەو پارەیەی کە شەش کەسەکە دەیدەن بە کۆمپانیاکە دەدرێتە بەشدار بووی یەکەم.

بۆیە لەڕووی شەرعییەوە بەشداریکردن لەم جۆرە کڕین و فرۆشتنانەی کۆمپانیاکان لە ژێر هەر ناوێك بێت ئەوا لیژنەی باڵای فەتوای هەرێمی کوردستان بە حەرام و ناشەرعی دەزانێت و رێگەی پێ نادرێت، چونکە:

١- ئەم جۆرە كڕین و فرۆشتانە جۆرێك لە (غرر - فریودان) ی تێدایە و سەرچاوەكانی فەرموودە ئاماژەیان بەوە داوە كە: ( نهى رسول الله صلى الله عليه و سلم عن الغرر)، وە پێشەوا (ڕەمەلی) لە (نهاية المحتاج) فەرموویەتی: (الغرر هو ما إحتمل أمرين أغلبهما أخوفهما).

٢- جۆرێكە لە خواردنی مالی یەكتر بە نابەجێیی، خوای گەورەش فەرموویەتی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُم بَيْنَكُم بِالْبَاطِلِ).

٣- خەڵەتاندن و جۆرێك لە قومار و فێلی تێدایە و پێغەمبەری ئیسلام محمد (درووی خوای لێ بێت) دەفەرموویێت: (من غشنا فليس منا). هەرووها فەرموویەتی: (لا ضرر ولا ضرار).

٤- زیان بە ئابووری وڵات دەگەیەنێت، چونكە ساڵانە بە مەلایین دۆلاری ئەم وڵاتە ڕەوانەی ئەم وڵاتە دەكرێت كە حیسابی بانكی كۆمپانیاكەی لێیە، بەبێ ئەوەی كەمترین خزمەت بە وڵاتی بەشداربووەكە بكرێت و بۆ بەرژەوەندی كەسێك زیان بە بەرژەوەندی گشتی وڵاتێك دەكەوێت.

لەبەر ئەو هۆیانەی كە لە سەرەوە ئاماژەیان پێدراوە، لیژنەی باڵای فەتوای هەرێمی كوردستان بریاری دا كە: لە ڕووی شەرعییەوە بەشداریكردن لەم جۆرە كڕین و فرۆشتنانەی كۆمپانیاكان لە ژێر هەر ناوێك بێت ئەوا لیژنەی باڵای فەتوای هەرێمی كوردستان بە حەرام و ناشەرعی دەزانێت و ڕێگەی پێ نادرێت و پێویستە هاوڵاتیانی كوردستان بەهەموو شێوەیەك خۆیان لەم جۆرە كڕین و فرۆشتنانە دوور بخەنەوە.

یەكێتی زانایانی ئایینی ئیسلامی كوردستان

لیژنەی باڵای فەتوا (٢٠١٥/١/٢٧).

زۆری نەخایاند ئەوەی پێشبینیمان دەكرد و لێی دەترساین ڕوویدا و كۆمپانیای (مێگا هۆڵدین) هەرەسی هێنا و پارەی خەڵكانێكی زۆری خوارد و هیچ كەسێكیش لەسەر ئەو بابەتە دادگایی نەكرا و سزا نەدرا.

هێشتا برینی زیانلێکەوتووانی (مێگا هۆڵدین) سارێژ نەبوو کۆمپانیایەکی تری هاوشێوەی ئەو کەبەهەمان سیستەمی (Network Marketing) کاردەکات بەناوی کۆمپانیای (Qnet) کەوتە بازاڕەوە، دیارە ئەمان ویستبوویان سوود لەهەڵەکانی مێگا هۆڵدین وەربگرن و هەر لەسەرەتاوە هەوڵی شەرعاندنی کارەکەیان بدەن و بۆ ئەو مەبەستەیش هەر زوو خۆیان گەیاندبووە لیژنەی باڵای فەتوای هەرێم و کۆمەڵێك زانیاری هەڵەیان لەسەر کارەکەیان بەلیژنەکە دابوو، لیژنەی باڵای فەتوای هەرێمیش لە (٢٠١٧/٩/٢٠) فەتوایەکی بەژمارەی (٢٠١٧/١٢) لە نزیکەی شەش لاپەڕەدا لەسەر کۆمپانیای (Qnet) دەرکرد و بە (١٧) مەرج و بەوردەکارییەکی زۆرەوە ڕێگەیان بەکاری کۆمپانیای ناوبراو دابوو.

ئەوەی لەفەتواکەدا جێی سەرنج بوو بەلای منەوە ئەوەبوو کە هەر ئەو لیژنە بەڕێزە بەر لە دوو ساڵ و هەشت مانگ لەو بەرواره و لەدەقی فەتواکەیاندا دەربارەی کاری کۆمپانیای (مێگا هۆڵدین) بەڕوونی و بەرەهایی باسییان لەحەرامی بازرگانیکردن بەسیستەمی بازاڕگەری تۆڕبەندی کردبوو، کەچی بەمەرج ڕێگەیان بە کاری کۆمپانیای (Qnet) دابوو، من دڵنیابووم لەوەی کە هەڵسوڕاوانی کۆمپانیای (Qnet) زانیاری درۆ و هەڵەیان بە لیژنەکە دابوو بۆیە ئەوانیش لەسەر هەڵەی ئەو هەڵسوڕاوانە فەتواکەیان دابوو.

سەرەڕای ئەوەیش هەڵسوڕاوانی کۆمپانیای (Qnet) کە دەچوونە لای هەرکەسێك بۆ ئەوەی پەلکێشی ناو پرۆژەکەیانی بکەن یەکسەر دەیانگوت فەتوای لیژنەی باڵای فەتوای هەرێممان پێیە کەکارەکەمان حەڵاڵە و هیچ کێشەی نییە ئیتر بەبێ ئەوەی باسی وردەکاری فەتواکەو مەرجەکانی بکەن. ئەمەیش ئاڵۆزی و بەرچاولێڵییەکی زۆری لای خەڵکی دروست کردبوو.

بۆیە بەندە و بەناچاری و پاش فشارێکی زۆری دۆستان کە داوای هەڵوێستی بەندەیان دەکرد لەسەر پرۆژەکە و فەتوای لیژنەکە، بەرنامەیەکی (٤٥) خولەکیم لەسەر ئەو بابەتە تۆمار کردو بڵاو کردەوە و تێیدا بەڕوونی قسەم لەسەر حەرامی کاری کۆمپانیای (Qnet) کردو گشت بەڵگەکانم لەو بارەیەوە خستە ڕوو.

تایبەت بەبڕیارەکەی لیژنەی باڵای فەتوایش لەوێدا دەڵێم:

(من نەهاتووم بەرپەرچی فەتواكەی یەكێتی زانایان بدەمەوە، من تەنها ڕون كردنەوەم هەیە لەسەر فەتواكە: ئەوان لە (٢٠١٧/٩/٢٠) دەڵێن دروستە كار لەگەڵ كۆمپانیای (Qnet) بكرێت، بەڵام فەتوایەكی لیژنەكە هەیە لە (٢٠١٥/١/٢٧) لەسەر كۆمپانیای (مێگا هۆڵدین) دەڵێت: مامەڵە كردن لەگەڵ كۆمپانیای (مێگا هۆڵدین) دروست نییە و حەرامە؛ چونكە هەمان سیستەمی (كیۆنێت)ی بەكارهێناوە، ئەوان ڕاستە چەند مەرجێكیان داناوە بۆ (كیۆنێت)، بەڵام بە بێ مەرج (مێگا هۆڵدین) بە نادروست دەزانن، من دەقی فەتواكەیان لەسەر (مێگا هۆڵدین) دەخوێنمەوە و بزانم چی جیاوازییەكیان هەیەو بەڵگەی فەتواكەی لیژنەی باڵا چییە؟، بۆ وتیان (مێگا هۆڵدین) دروست نییە و ئێستا بۆ دەڵێن (Qnet) دروستە، ئەمە دەقی فەتواكەیانە: ( بۆیە لەڕوی شەرعییەوە بەشداری كردن لەم جۆرە كڕین‌و فرۆشتنانەی كۆمپانیاكە لە ژێر هەر ناوێكدا بێت، ئەوا لیژنەی باڵای فەتوای هەرێمی كوردستان بە حەرام‌و ناشەرعی دەزانێت‌و ڕێگەی پێنادرێت، چونكە ئەم جۆرە كڕین فرۆشتنانە، جۆرێك لە فریودان‌و غەرەری تێدایە وجۆرێكە لە خواردنی ماڵی یەكتر بە نابەجێیی و خەڵەتاندن‌و جۆرێك لە قومارو فێڵی تێدایەو زیان بە ئابوری وڵات دەگەیەنێت ...لەبەر ئەو هۆیانەی لەسەرەوە ئاماژەیان پێدراوە لیژنەی باڵای فتوای هەرێمی كوردستان بەشداریكردن لەم جۆرە كڕین و فرۆشتنەی كۆمپانیاكان لە ژێر هەر ناوێكدا بێت ئەوا لیژنەی باڵای هەرێمی كوردستان بە ناشەرعی دەزانێت و ڕێگەی پێنادرێت، پێویستە هاوڵاتیانی هەرێمی كوردستان لەم جۆرە كڕین فرۆشتنانە دوور بكەونەوە).

تكام وایە لەو بەڕێزانەی (یەكێتی زانایانی ئاینی كوردستان) و مامۆستایانی قەدر گران‌و بەنرخ وردتر بەدواداچوون بكەن بۆ كاری كۆمپانیاكە، وردتر لێكۆڵینەوە بكەن لەسەر ئەو كەسانەی كە ئێستا سكاڵایان كردوە لەسەر كۆمپانیاكە، وە ئەو كاڵایانەی كە ساغ كراوەتەوە، ئێمە پێمان وایە ڕووی ڕاستی كۆمپانیاكە لای یەكێتی زانایان ئاشكرا نەكراوە، پێویستە بەدواداچوونی زیاتر بكرێت‌و جارێكی دیكەش خوێندنەوە بۆ فەتواكە بكرێت).

دواتریش من دەقی بەرنامە و بەڵگەكانم خستە خزمەتی لیژنەی فەتواو پاش ماوەیەك بەڕێزەوە پێداچونەوەیان بۆ بڕیارەكەیان كرد و لە (٢٠١٨/٨/٢٠) بڕیاری حەرامی كاری كۆمپانیای (Qnet) یان دەركرد وفەتوای پێشویان هەڵپەسارد و ئەمەیش دەقی فەتواكەیانە.

یەکێتی
زانایانی ئاینی ئیسلامی کوردستان
مەکتەبی تەنفیزی
لیژنەی باڵای فەتوا

بسم الله الرحمن الرحيم

اتحاد
علماء الدين الإسلامي في كوردستان
المكتب التنفيذي
اللجنة العليا للإفتاء

بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

ڕوونکردنەوەیەك لە لایەك لیژنەی باڵای فەتوا لە هەرێمی کوردستان

سەبارەت بە مامەڵەکانی کۆمپانیای Qnet

دوای ئەوەی لیژنەکەمان لە بەرواری ٢٩/ ذی الحجة / ١٤٣٨ بەرامبەر بە ٢٠١٧/٩/٢٠ بە ژمارە ( ٢٠١٧/١٢ ) لە هەشت لاپەڕەدا فەتوایەکی بە مەرج و سنوورداریدا بە دروستی مامەڵەکردن لەگەڵ کۆمپانیای Qnet وە تیایدا بە بە جێبەجێ کردنی ( ١٧ ) مەرج و دارشتەی فیقهی ڕێگەپێدرا بوو کە مامەڵە لەگەڵ کۆمپانیای ناوبراو بکرێت .

بەڵام دوای ئەوەی بۆ لیژنەکەمان ڕوون بویەوە کە کۆمپانیاکە هەندێك لەو مەرجانەی جێبەجێ نەکردووە بە تایبەتی مامەڵەکردن بە زێڕ و وەرگرتنی ڕسومات و تەحایول لە مامەڵەکاندا و نا بەرامبەربونی نرخی کاڵاکان لە تەك نرخی بازاڕدا بە شێوازێکی زۆر ترسناك کە نیشانەیە لەسەر ئەوەی کە ئامانجی تر هەیە لە خودی مامەڵەکاندا ، هەروەها نەشارەزایی گەنجان لە تێکڕای پرۆسەکە و نا حاڵی بونیان لە مافەکانیان کە لە فەتوا پێشوەکەماندا بە دوور و درێژی ڕونکرابویەوە ، هەروەها بەکارهێنانی فەتواکەی لە دەرەوەی هەرێم کە بە هیچ شێوەیەك لە لیژنەکەمانەوە ڕێگەی پێ نەدرا بوو .. وێڕای هەندێك وردەکاری تر کە سەرپێچی و دەرچوونە لە ناوەڕۆکی فەتواکەی لیژنەی باڵای فەتوا کە لە لایەن زۆرێك لە شاهێد حاڵەکانەوە لە تێکڕای هەرێمی کوردستانەوە ئاگادار کرایەتەوەو بەدواداچونمان بۆ کردووە لە بەر ئەمانە لیژنەی باڵای فەتوای هەرێمی کوردستان بڕیاری دا :

١. هەڵپەساردنی فەتوای پێشوترمان ژمارە ( ٢٠١٧/١٢) لە ٢٠١٧/٩/٢٠.
٢. لە دوای ئەم ڕونکردنەوەیە بە هیچ شێوەیەك مامەڵە لەگەڵ کۆمپانیای کیونێت بە دروستی نازانین و داوایش لە کۆمپانیای ناوبراو دەکەین فەتوای پێشومان ژمارە (٢٠١٧/١٢) بەکار نەهێنێت بۆ ڕاکێشانی هاوبەش .

خوای گەورە هاوکاری ڕاستگۆیانە ... وصلی الله تعالى على سيدنا محمد واله وصحبه اجمعين

لیژنەی باڵای فەتوا لەهەرێمی کوردستان
هەولێر ... کوردستان
١/ ذو الحجة ١٤٣٩ ك بەرامبەر ٢٠١٨/٨/١٢ ز

ناونیشان: هەولێر - شەقامی ٦٠مەتری - بەرامبەر پەرلەمانی کوردستان
العنوان : إقليم كوردستان - اربيل - الشارع الستيني - مقابل البرلمان
www.zanayan.org

دیار بوو هەڵسوڕاوانی (Qnet) بەو فەتوایە زۆر قەڵس بوون و کەوتنە پەلەقاژەو لەلایك گومانیان لەسەر لیژنەکە دروست دەکرد کە خەڵکانی نەشارەزاو ناپسپۆڕن و لە بابەتەکە تێنەگەیشتون، لەلایەکی تر گومانیان لەسەر خودی فەتواکە دروست دەکرد کە لیژنەکە نەیگوتوە کاری (Qnet) حەرامە بەڵکو فەتوای پێشووی هەڵپەساردووە و بەڵێنی بەدواداچوونی زیاتری کردووە بۆ کاری کۆمپانیا، لە لایەکی تریشەوە پەیوەندییان کردبوو بەلیژنەی فەتواوە و تکای ئەوەیان کردبوو کە جارێکی تر بەفەتواکەیاندا بچنەوە.

پاش لێكۆڵینەوەو پێداچوونەوەی زیاتر بەكاری كۆمپانیای ناوبراو لیژنەكە جارێكی تر و پاش نزیكەی (٨) مانگ لەفەتوای پێشووی و بەدیاریكراوی لە (٢٠١٩/٤/٣٠) زۆر بەڕوونی فەتوای حەرامی كاری كۆمپانیای (Qnet) و هاوشێوەكانی دەركرد كە ئەمە دەقەكەیەتی:

إتحاد
علماء الدين الإسلامي في كوردستان
المكتب التنفيذي
المجلس الأعلى للإفتاء

بسم الله الرحمن الرحيم

یەكێتی
زانایانی ئاینی ئیسلامی كوردستان
مەكتەبی تەنفیزی
ئەنجومەنی بالای فەتوا

(( حوكمی مامەڵە كردنی شەبەكی و هەرەمی بە گشتی ، و مامەڵە كردن لەگەڵ هەردوو كۆمپانیای كیونێت و فۆرئێڤەر بە تایبەتی))

خوای گەورە دەفەرموێ ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ....فَسْئَلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ النحل : ٤٣

ئەنجومەنی بالای فەتوا لە هەرێمی كوردستان پاش ورد بوونەوە و لێكۆڵینەوەیەكی زۆر ورد لەم جۆرە مامەلانە و تێرامان لە دەقە شەرعیەكان، و راوێژكردن لەگەڵ كۆمەڵێك لە پسپۆڕانی فیقهی ئابووری ئیسلامی لە ناوەوە و دەرەوەی كوردستان، ئەنجومەنی باڵای فەتوا لە دانیشتنی ئاسایی خۆی لە ٢٠١٩/٤/٣٠ بۆی روون بوەوە كە:
(( مامەڵەی بازرگانی شەبەكی و هەرەمی بەگشتی، و بەتایبەتی مامەڵەكردن لەگەڵ كۆمپانیای كیونێت و فۆرئێڤەر و هاوشێوەكانی لە رووی شەرعیەوە حەرامە، و داوا لە هاولاتیانی كوردستان دەكەین خۆیان لێی بپارێزن، وەك پێشتریش لە فەتوای تایبەت بە هەڵپەساردنی مامەڵەكردن بە كیونێت باسی لێوە كراوە))

تێبینی:

١–ئەم فەتوایە دوا فەتوایە و بریاری ئەنجومەنی باڵای فەتوایە لە هەرێمی كوردستان، و ئەنجومەنی فەتوا لێكۆڵینەوەی لەم بابەتە كۆتایی پێهێناوە، و تەنها ئەم فەتوایە كاری پێ دەكرێت، و فەتواكانی پێشوومان كاریان پێ ناكرێت .

٢–بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ئەم فەتوایە و بەڵگەكانی بگەرێنەوە بۆ رۆنكردنەوەی ئەنجومەنی باڵای فەتوا كە لە ١/ذو الحجة ١٤٣٩ك – ٢٠١٨/٨/١٢ز ئاماژەمان بۆ كردووە، و بە نوسراومان ژمارە ٣٩٩ لە ٢٠١٨/٨/١٣ ئاراستەی سەرجەم لقەكانمان كردبوو .

خوای گەورە پشت و پەنای هەموو لایەكمان بێت

ئەنجومەنی باڵای فەتوا لە هەرێمی كوردستان
٣٠ – ٤– ٢٠١٩ ز / ٢٤ ی شەعبانی ١٤٤٠ ك

ناونیشان: هەولێر – شەقامی ٦٠مەتری - بەرامبەر پەرلەمانی كوردستان
العنوان : إقليم كوردستان – اربيل – الشارع الستيني – مقابل البرلمان
www.zanayan.org

## تەوەری حەوتەم

## مەرجەکانی دروستی مامەڵە کردن لەگەڵ کۆمپانیاکانی (Network Marketing)

لە کۆتا تەوەری ئەم توێژینەوەیەدا پێم خۆشە هەموو لایەك ئەوە بزانن کە زۆرێك لەبابەتەکانی حەرام و حەڵاڵ پەیوەستن بە کۆمەڵێك هۆکارەوە و هەر کات ئەو هۆکارانە گۆڕانکارییان بەسەردا هات ئەو کات حوکمە شەرعییەکانیشیان گۆڕانکارییان بەسەردا دێت، بۆیە زۆرێك لەبابەتەکانی حەرام و حەڵاڵ ئەگەری گۆڕانکارییان هەیە، سەبارەت بە کاری کۆمپانیای (Qnet) و هاوشێوەکانیشی هەر بەهەمان شێوەیە و کارەکەیان لە ئێستادا و بەو سیستەمەی کاری پێدەکەن حەرامە و حەرامییەکەیشی هۆکاری خۆی هەیە و هەرکات ئەو هۆکارانە لابران یان گۆڕانکارییان بەسەردا هات ئەو کات حوکمی کارەکەی ئەوانیش دەگۆڕێت.

بۆیە من لێرەدا کۆمەڵێك مەرج باسدەکەم کە ئەگەر کۆمپانیاکانی بازاڕگەری تۆڕبەندی پێوەی پابەندبن ئەو کات کارەکەیان حەڵاڵ دەبێت و هیچ گرفتێکی شەرعییان نامێنێت، مەرجەکانیش بریتیین لە:

١- کۆمپانیا کڕینی کاڵا یان پێدانی بڕێك پارە نەکاتە مەرجی بەشداربوون لەسەر ئەو کەسانەی دەیانەوێت بەشداری لەساغکردنەوەی کاڵاکانی کۆمپانیادا بکەن، بۆیە دەبێت کڕینی کاڵاکان ئارەزوومەندانە بێت، خۆ ئەگەر کاڵا نەبوو نابێت مەرجی پێدانی پارە هەبێت لەبەرامبەر مافی بەشداربوون لەساغکردنەوەی کاڵاکان.

٢- نرخی کاڵاکان هاوشێوەی نرخی بازاڕ بێت وگرانتر نەبێت.

٣- کاڵاکان شتی قەدەغەکراو و ناشەرعییان تێدا نەبێت لە نموونەی عارەق یان گۆشتی بەراز.

٤- خودی کاڵاکان ئامانج بن لەکاتی کڕینیاندا نەك تەنها ئامرازبن بۆ بەشداریکردن لەسیستەمەکەدا.

٥- لەکاتی کڕینی کاڵاکان هەموو ڕێکارە شەرعییەکانی مامەڵە کردن بەو جۆرە کاڵایانەوە ڕەچاو بکرێت، بۆ نموونە ئەگەر کاڵاکان ئاڵتون یان زیو بوون دەبێت لەکاتی گرێبەستەکەدا کاڵا ونرخەکەی ئامادەبن.

٦- كواليتى كاڵاكان بەو شێوەیە بێت كەباس دەكرێت وهیچ درۆ وفێڵ وپیاهەڵدانێكى نادروست لەساغكردنەوەى كاڵاكاندا نەبێت.

٧- بەشداربوو لەبەرامبەر هەر هەوڵ و ماندوبوونێكى لەپێناو بانگەشەكردن و ساغكردنەوەى كاڵاكان پارەى خۆى وەربگرێت و كرێكەى وابەستەى دروستبوونى سیستەمى ڕاست و چەپ و یەكسانى باڵەكانى و ئەو جۆرە فێڵ وتەڵەكانە نەكرێت، بۆ ئەوەى ڕەنجەكەى بەفیرۆ نەڕوات و وابەستەى شتێك نەكرێت كەلەتواناى ئەودا نییە و پەیوەندى بەخودى كارى ئەمەوە نییە.

٨- بەڵێنى داهاتى وەهمى وقازانجى نادروست بەبەشداربوو نەدرێت، چونكە دەچێتە خانەى درۆ و هەڵخەڵەتاندن ومامەڵەكە حەرام دەكات.

٩- بەشداربوو تەنها بەرامبەر كار وڕەنجى خۆى پارە وەربگرێت نەك لەبرى ڕەنج و ماندوبونى خەڵكانى تر كە ڕەنگە ئەم هەر نەیبینیبن و نەشیانناسێت، چونكە ئەوە بەشێكە لەخواردنى ماڵى خەڵكى بەناحەق.

١٠- دەبێت كۆمپانیاكان دیار و ناسراو بن و هەموو گرەنتییەكى یاساییان هەبێت و بەشداربوو بتوانێت لەكاتى بوونى هەر كێشەیەك سكاڵاى یاساییان لەسەر تۆمار بكات و مافەكانى خۆى بۆ بگەڕێتەوە.

١١- كارى كۆمپانیا لەچوارچێوەى یاسا كارپێكراوەكانى ئەو شوێنانە بن كە كارى تێدا دەكەن و زیان بەئابوورى نیشتیمانى نەگەیەنێت.

هەر كۆمپانیایەك لەكۆمپانیاكانى (Network Marketing) پابەند بوو بەكۆى ئەم مەرجانەوە ئەوە كارەكەى دروستەو كێشەى نییە بەپێچەوانیشەوە هەر مەرجێك لەو مەرجانەى تێدا نەبێت كارەكەى حەرامە ودروست نییە مامەڵەى لەگەڵدا بكرێت.

## باسی سێیەم:
## حوکمی مامەڵەکردن لە بازاڕی ( Forex)
## وکارکردن بە سیستەمی پەراوێزی بازرگانی (Margin)

- پێشەکی.
- تەوەری یەکەم: پێناسەکان.
- تەوەری دووەم: هەنگاوەکان و لایەنەکانی گرێبەستەکە.
- تەوەری سێیەم: پێکهاتەی مامەڵەکە.
- تەوەری چوارەم: سرووشتی شەرعی مامەڵەکە.
- تەوەری پێنجەم: حوکمی شەرعیی کارکردن لە (Forex) وبازرگانی (Margin) دا.

## پێشەکی:

بازاڕی فۆڕێکس (**Forex**): یەکێکە لە هەرە بازاڕە زەبەلاحەکانی دونیا کە تایبەتە بە ئاڵوگۆڕکردنی دراوی بیانی.

خودی وشەی (**Forex**) یش کورتکراوەی هەردوو وشەی (**Foreign Exchange**) کە بە واتای بازاڕی ئاڵوگۆڕکردنی دراوی بیانی دێت و لەم بازاڕەدا بازرگانی بەگرنگترین و بنەڕەتی ترین دراوەکانی دونیاوە دەکرێت لە نموونەی: دۆلاری ئەمریکی (**USD**) و یۆرۆ (**EUR**) و جونەیهی ئستەرلینی (**GBP**) و فرەنکی فەرەنسی (**CHF**) و یەنی یابانی (**JPY**) و دۆلاری ئوسترالی (**AUD**) و دۆلاری کەنەدی (**CAD**) وچەندین دراوی تری دونیا بەپێی گرنگی و کاریگەرییان لەسەر بازاڕو نرخی کاڵاکان.

یەکێك لەتایبەتمەندییەکانی ئەم بازاڕە ئەوەیە کەشوێنێکی دیاریکراوی نییە ( **Over the counter**) و لەڕێی تۆڕەکانی پەیوەندییەوە مامەڵەی تێدا دەکرێت ولەهەفتەیەکدا (٥) ڕۆژ و بۆماوەی (٢٤) کاژێر لە دوو شەممەوە تا هەینی کراوەیە و بڕی ئەو بازرگانییەی کە لەم بازاڕەدا لەشەو و ڕۆژێکدا ئەنجام دەدرێت بە (٥) تریلیۆن دۆلار مەزەندە دەکرێت و هەر کەس بیەوێت و لەهەرکوێ بێت و بەهەر بڕە پارەیەك بێت دەتوانێت لەڕێی بۆرسە جیهانییەکانەوە کاری بازرگانی تێدا ئەنجام بدات.

سەرەتای مامەڵەکردنی ڕۆژانە لەم بازاڕەدا بەپێی سروشتی شەو و ڕۆژ لەجیهاندا لە نیوزلەنداو ئوستورالیاوە دەست پێ دەکات و پاشان ئاسیا و ئەوروپا و دواتر بە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کۆتایی دێت.

سروشتی مامەڵەکردن لەم بازاڕەدا وایە کە هەمیشە بازرگانی بە دوو دراوەوە دەکرێت واتا کەسێك دراوێکی هەیە و بەپێی پێشبینیەکانی بۆ داهاتووی دراوەکان و بەرزو نزم کردنی نرخەکانیان دراوێکی تری پێ دەکڕێت، بۆ نموونە کەسێك دۆلاری ئەمریکی هەیە و پێشبینی دەکات کە بانکی ناوەندی ئەوروپی نرخی سوو بەرز بکاتەوە بەمەیش نرخی یۆرۆ لەداهاتوودا بەرامبەر دۆلار بەرز بێتەوە بۆیە دەچێت یۆرۆی پێ دەکڕێت و بەپێچەوانەوە. خۆ ئەگەریش پێشبینییەکە وا دەرنەچو و نرخی سوو دابەزی ئەو کات کەسی بەشداربوو زیان دەکات.

دیارترینی ئەو مامەڵانەی کە لەڕێی ئەم بازاڕەوە ئەنجام دەدرێت و هۆکارێکی سەرەکییە بۆ زیادکردنی ڕێژەی بەشداربووانی بازاڕەکە، بازرگانی کردن و کڕین و فرۆشتنە بە پەراوێز (Margin) (الرافعات المالية) کە بابەتی بنەڕەتی توێژینەوەکەی ئێمەیە.

سەرەتای سەرهەڵدانی ئەم بیرۆکەیە بۆ حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو دەگەڕێتەوە، کاتێك هەندێك لە وڵاتانی خاوەن سەنگ و دراو و دارایی بەهێز بڕیاریاندا دەست لە پشتیوانی ڕاستەوخۆی نرخی دراوەکانیان هەڵبگرن و وازی لێبهێنن بۆ نرخی بازاڕ و پێوەرە ئابوورییەکان لە سیستەمێکدا کە پێی دەگوترێت (تعويم العملة)، بەو هۆیەیشەوە نرخی دراوەکان بەردەوام گۆڕانکاریان بەسەردا دەهات و زیادو کەمیان دەکرد، بەڵام ئەم گۆڕانکارییانە بەڕێژەیەکی زۆر و بەرچاو نەبوون بەتایبەتی بۆ ئەو کەسانەی کە خوازیاربوون لەم بوارەدا بازرگانی بکەن و داراییەکەی مامناوەندیان هەبوو.

لەو نێوەندەدا لایەنە پەیوەندیدارەکانی بواری بازرگانیکردن بە دراوەوە بیرۆکەی بەرزکردنەوەی هەبووی ئەو جۆرە کەسانەیان هێنایە ئاراوە تا تەماعی زیاتریان بخەنە بەردەم و کڕیار و خوازیاری زیاتر بۆ بازاڕی دراو و بازرگانیکردن لەو بوارەدا پەیدا بکەن.

هەرچەندە ڕووکەشی بیرۆکەکە وایە کە خزمەت بەچینی هەژار و خاوەن دەسمایە مامناوەندەکان دەکات بەڵام لە ڕاستیدا بیرۆکەکە بەپێچەوانەوەیەو بۆ زیاتر خزمەتکردنی کۆمپانیا خاوەن دەستمایە زەبەلاحەکانەو لەسەر حیسابی ئەو وەبەرهێنە بچوکانەیەو دەرەنجام مامەڵەکان بە مایەپووچی ئەوان کۆتایی دێت.

ئەم بازاڕ و جۆرە مامەڵەیە ماوەیەکە لەکوردستان خەڵکانێکی زۆری بە خۆیەوە سەرقاڵ کردووە و بەردەوام پرسیاری لەبارەوە دەکەن و سەرچاوەیەکی زانستی ئەوتۆیان بە زمانی کوردی لەبەردەستدا نییە تا بۆی بگەڕێنەوە و لە ڕێیەوە وەڵامی پرسیارەکانیان وەربگرنەوە، بۆیە پێم خۆش بوو تەوەرێکی توێژینەوەکەمان بۆ ئەم باسە تەرخان بکەین.

گرنگی لێکۆڵینەوە لەم باسە خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە کەلێنێك لە کتێبخانەی کوردی پڕدەکاتەوە و بەرچاوڕوونی شەرعی و ئابووری دەداتە هەموو ئەو بەڕێزانەی کە خوازیارن زانیارییان دەربارەی ئەم بازاڕو مامەڵەیە دەست بکەوێت یاخود بەشداری تێدا بکەن.

میتۆدی باسەكە میتۆدێكی شیكاری بەراوردكاری دەبێت لەنێوان ڕەهەندەكانی ئەم باسە و بنەماكانی ئابووری ئیسلامی و مامەڵە شەرعییەكاندا.

پەیكەری باسەكەیشمان لەم پێشەكییە و پێنج تەوەر پێك دێت، لە تەوەری یەكەمدا پێناسەی گرنگترینی ئەو زاراوانەم كردووە كە دەبنە بنەما بۆ تێگەیشتن لە خودی باسەكە و گەڵاڵەكردنی بۆچوونی شەرعی لەبارەیانەوە، پاشان و لە تەوەری دووەمدا باسم لە هەنگاوەكان و لایەنەكانی گرێبەستەكە وشێوازی بەشداریكردن لە مامەڵەكەدا كردووە و لەتەوەری سێیەمیشدا قسەم لەسەر پێكهاتەی مامەڵەكە كردووە كە چەند ڕەهەند و چەمكی شەرعی لەخۆ دەگرێت و تەوەری چوارەمیشم تایبەت كردووە بە باسكردنی سرووشتی شەرعی مامەڵەكە و لەگەڵ كام لەچەمكە شەرعییەكان زیاتر یەك دەكاتەوە و لە كۆتایی و تەوەری پێنجەمیشدا وردەكاری حوكمی شەرعی مامەڵەكەم ڕوونكردۆتەوە.

## تەوەری یەكەم:
## پێناسەكان

بەر لەوەی بچینە سەر ناوەڕۆكی بابەتەكەمان سەرەتا پێویستە ئەوە بڵێین كە كاركردن لەخودی بۆرسەو بازاڕی ئاڵوگۆڕكردنی دراوەكان هیچ گرفتێكی شەرعی نییە بەمەرجێك مامەڵەكان بەپێی ئەو پێودانگە شەرعییانە بن كە لە ئابووری ئیسلامییدا باس كراوە وڕێوشوێنی بۆ دانراوە، بەتایبەتی لەكاتی مامەڵە كردن بەدراوەوە یان بەهەر شتێكەوە كە حوكمی دراوی هەیە.

ئێستایش و لەدەستپێكی باسەكەماندا پێناسەی گرنگترین ئەو زاراوانە دەكەین كە بنەمای سەرەكین بۆ خودی كارەكەو وتوێژینەوەكەی ئێمە و ڕەنگە كەمێك ئاڵۆز بن و خوێنەر بەئاسانی لێیان تێنەگات لەوانە:

١- كڕین بەپەراوێز (الشراء بالهامش) (Margin) : بریتییە لە گرێبەستێكی ناچاركار (عقد إذعان) لەبواری ئاڵوگۆڕكردنی دراو ومامەڵە داراییەكاندا وتێیدا كەسی بەشداربوو (كڕیار)

بڕێكی زۆر كەمی پارەی گرێبەستەكە دابین دەكات و بەشی هەرەزۆری پارەكە كۆمپانیایەكی نێوەندگیر لەڕێی خۆیەوە یان دامەزراوەیەكی داراییەوە دابینی دەكات بەمەرجێك كۆی گرێبەستەكە بەبارمتە لای خۆی بمێنێتەوە و خۆی سەرپەرشتی ڕاستەوخۆی مامەڵەكان بكات و مافی ئەوەی هەبێت هەركات مەترسی لەسەر پارەكانی دروست بوو تاك لایەنە و بێ گەڕانەوە بۆ بۆچوونی كەسی بەشداربوو دراوەكە بفرۆشێت و مامەڵەكە كۆتایی پێ بهێنێت.

٢- بەرزكردنەوەی هەبووی دارایی (الرافعة المالية) (**leverage**): واتا بەرز كردنەوەی هەبووی دارایی كەسی بەشداربوو لە (١) تا (٤٠٠ — ٥٠٠) قاتی خۆی و زیاتریش، واتا ئەگەر كەسی بەشداربوو تەنها (١٠٠$) ی هەبێت ئەوا دەتوانێت لەڕێی كۆمپانیا نێوەندگیرەكانەوە گرێبەستێك ئەنجام بدات بە بڕی (٥٠٠٠٠$) وباقی پارەكە كۆمپانیا دابینی دەكات، هەرچەندە لە ساڵی (٢٠٠٤) ەوە لە ئەمریكا یاسایەك دەرچووە ڕێگە نادات بە زیاتر لە (١-١٠٠) مامەڵە بكرێت، بەڵام لەبازاڕەكاندا تا ئێستا مامەڵە بەو ڕێژانەوە دەكرێت كەئاماژەمان پێكرد.

٣- سپرید (**Spread**): بریتییە لە جیاوازی نێوان نرخی كڕین و فرۆشتنی دراوەكان لەیەك كاتدا كە لە شێوەی چەند خاڵێكدا دیاری دەكرێت، واتا كاتێك بەشداربوو دەیەوێت دراوێك بكڕێت دەبێت بەنرخێكی گرانتر بیكڕێت لەنرخی بازاڕ یان لەو نرخەی كەدەیەوێت پێی بفرۆشێت، ئەمەیش یەكێكە لەو سوودە سەرەتایی و سەرەكییانەی كە كۆمپانیا نێوەندگیرەكان لەدەرەنجامی مامەڵەكان لەبەشداربووەكانەوە دەستیان دەكەوێت، ئەو جیاوازییەی نێوان نرخی كڕین و فرۆشتنیش لە دراوێك بۆ دراوێك دەگۆڕێت بەپێی گرنگی دراوەكە و ڕێژەی كڕیارانی و ئەو قازانجەی لێی چاوەڕوان دەكرێت[٣٧].

بانگەوازی ئاگاداركردنەوە (نداء الهامش) (**Margin Call**): كاتێك مامەڵەكەی بەشداربوو دەكەوێتە زیانەوە بەشێوەیەك كە خەریكە هەبووی ڕاستەقینەی بەشداربوو بەتەواوی بگرێتەوە، كۆمپانیا لەترسی ئەوەی كەنەبا زیانەكان سەربكێشێت بۆ پارەكانی ئەمیش و بەخاتری پاراستنی پارەكانی خۆی ئاگاداركردنەوەیەك ئاڕاستەی كەسی بەشداربوو دەكات

---

٣٧ ـ د. شوقي أحمد دنيا، بحث بعنوان المتاجرة بالهامش، رابطة العالم الإسلامي، الدورة (١٨) للمجمع الفقهي، ص٥. محمد بن إبراهيم السحيباني، آليات نقل الملكية في الأسواق المالية، بحث مقدم للمؤتمر العالمي الثاني للاقتصاد الإسلامي بكلية الشريعة والدراسات الإسلامية جامعة أم القرى، مكة المكرمة، ١٤٢٤هـ، ص٤

بەوەی کە مامەڵەکەی لە زیاندایە و لەقۆناغێکی مەترسیداردایە، لەم حاڵەتەیشدا پێویستە کەسی بەشداربوو یان دراوەکان بفرۆشێت بە زەرەر و ئەکاونتەکەی دابخات، یانیش پارەی زیاتر بخاتە سەر هەبووەکەی لەلای کۆمپانیا، خۆ ئەگەر هیچ کام لەوانەی نەکرد ئەوە کەی ڕێژەی زیانەکە گەیشتە ئەوەی هەموو پارەی بەشداربوو بگرێتەوە کۆمپانیا خۆی تاك لایەنە پارەکە دەفرۆشێتەوە و ئەکاونتەکەی دادەخات.

## تەوەری دووەم:
## هەنگاوەکان و لایەنەکانی گرێبەستەکە

سرووشتی ئەم مامەڵەیە وایە کە بەچەند هەنگاوێك دەست پێدەکات بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

١- سەرەتا کەسێك هەیە پارەیەکی ئەوتۆی بەدەستەوە نییە و خوازیارە لە ڕێی بازاڕی فۆرێکسەوە بەزیاتر لەو بڕە پارەیەی خۆی بازرگانی بکات تا لەماوەیەکی کەمدا قازانجێکی زۆر بەدەست بێنێت، بۆ نموونە کەسەکە تەنها (١٠٠$) ی هەیە و خوازیارە بە بایی (٥٠٠٠٠$) مامەڵە بە دراوەوە بکات. هەر بۆیە لەزمانی عەرەبیدا بەم مامەڵەیە دەوترێت (المتاجرة بالهامش) چونکە بەشداربوو پەراوێزێکی کەمی نرخی ڕاستەقینەی مامەڵەکە دەدات.

٢- کۆمەڵێك کۆمپانیای دارایی هەن کە لە (Forex) دا کار دەکەن و هەر یەکەیان لەسەر ئەنتەرنێت مەنەسە یان (Platform)ی تایبەت بەخۆیان هەیەو ئامادەن ئەو خواستەی بەشداربوو جێبەجێ بکەن و بە پێنج سەد (٥٠٠٪) هێندەی پارەی ڕاستەقینەی (الرصيد الحقيقي) خۆی هەبووەکەی بەرز بکەنەوەو مافی ئەوەی پێ دەدەن دراو بکڕێت؛ و ئەو بڕە پارەیەش کۆمپانیا خۆی دابینی دەکات یاخود بەسوو لە بانکێکی وەردەگرێت هەر بۆیە لەزمانی عەرەبیدا بەم جۆرە مامەڵەیە دەگوترێت (الرافعات المالية).

٣- کەسی بەشداربوو لەڕێی ئەنتەرنێتەوە پەیوەندی بەیەکێك لەو کۆمپانیایانەوە دەکات و پاشان دەچێت لەڕێی یەکێك لە بانکەکانەوە ئەو بڕە پارەیە دەخاتە سەر حسابی

كۆمپانیا و لەبەرامبەردا كۆمپانیا لای خۆی ژمارەیەكی حسابی بەو بڕە پارەیە بۆ دەكاتەوە و ناوی تێپەڕ و ژمارەی نهێنی حسابەكەی پێدەدات و لەو ڕێیەوە كەسی بەشداربوو چاودێری نرخی دراوەكان دەكات و كڕین و فرۆشتنییان پێوە ئەنجام دەدات.

٤- بەپێی ئەو گرێبەستەی نێوان كۆمپانیا و كەسی بەشداربوو كۆمپانیا هیچ پەیوەندییەكی بە زیان و قازانجی مامەڵەكەوە نییە و ئەگەر مامەڵەكە لە قازانجدا بوو ئەوە كێشەی نییە و بەشداربوو كەی خۆی ویستی دراوەكانی دەفرۆشێت، ئەگەریش لە زیاندا بوو ئەوە هەر سەرەتا كۆمپانیا مەرجی ئەوە لەسەر بەشداربوو دادەنێت كە هەر كات نرخی دراوەكە بەڕێژەی پارەی كەسی بەشداربوو دابەزی ئەو كات كۆمپانیا بۆی هەیە تاك لایەنە بیفرۆشێت بەبێ گەڕانەوە بۆ ڕەزامەندی بەشداربوو.

٥- پاش تەواوبوونی مامەڵەكە گرێبەستەكە لەسەر شاشە دەكرێت بەناوی بەشداربووەوە و وا وێنا دەكرێت كە ئەو خاوەنداریێتی دەكات بەڵام ئەمە تەنها ڕووكەشە و خاوەنی ڕاستەقینەی دراوەكان كۆمپانیا نێوەندگیرەكەیە و لەبری ئەو بڕە پارە زۆرەی كەداوێتی كۆی پارەی گرێبەستەكە بەبارمتە لای خۆی دەهێڵێتەوەو تامامەڵەكە لەقازانجدا بێت بەشداربوو خۆی بڕیار لە مانەوە یان فرۆشتنەوەی دراوەكانی دەدات، بەڵام لەكاتی دابەزینی نرخەكەیدا بەشداربوو تا ڕێژەی پارەكەی خۆی خاوەن بڕیارە و لەوە زیاتر كۆمپانیا خۆی بڕیار دەدات.

٦- لەبەرامبەر هەر مامەڵە پێوەكردنێكی دراوەكان بەشداربوو دەبێت بڕی (٣٥$) بدات بەكۆمپانیا بەبێ ڕەچاوكردنی ئەوەی كە ئایا زیان یاخود قازانجی كردوە[٣٨].

٧- لایەنێكی تر هەیە لە پرۆسەكەدا كە ئەو نرخی دراوەكان دیاری دەكات و هەبووە داراییەكانی دەخاتە بازاڕەوە تا مامەڵەی پێوە بكرێت و زۆربەی كات ئەم لایەنە بانكە زەبەلاحە جیهانییەكانن[٣٩].

---

٣٨ - بڕوانە: http://www.mgforex.com/arb/forex_trading/content/rollover_interest.htm.

http://www.forexyard.com/ar/margin_leverage.

٣٩ - د منير إبراهيم هندي، الأوراق المالية وأسواق المال، منشأة المعارف، ٢٠٠٦، ص١٣٧. د. محمد صالح جابر، الاستثمار بالأسهم والسندات وتحليل الاوراق المالية، مؤسسة الخليج للطباعة والنشر، ص٢٧٥. طاهر حيدر حردان، مبادئ الاستثمار، ص٥١ -٥٢.

## تەوەری سێیەم:
## پێكهاتەی مامەڵەكە

ئەم سیستەمە سیستەمێكی ئاڵۆزە و لەیەك كاتدا چەند مامەڵەیەكی شەرعی لەخۆ دەگرێت لەوانە:

١- بازرگانیكردن: سەرەتای بیرۆكەكە بەوە دەستپێدەكات كە كەسێك دەیەوێت لەبواری ئاڵوگۆڕكردنی دراو و ئاڵتون و پشك و قەواڵە داراییەكان بازرگانی بكات.

٢- قەرز: بریتییە لەو بڕە پارەیەی (leverage) كە كۆمپانیای نێوەندگیر دەیخاتە سەر هەبووی (رصید) كەسی بەشداربوو.

٣- باجی جێگیركردن (رسوم التثبیت): بریتییە لەو بڕە پارەیەی كە لە ڕێژەیەكی سەدی قەرزەكە پێك دێت و دەبێت بەشداربوو ڕۆژانە بیداتە كۆمپانیای نێوەندگیر ئەگەر ئەو ڕۆژە كۆتایی بە مامەڵەكە نەهێناو ئەكاونتەكەی سفر نەكردەوە، مەبەستی دانانی ئەم باجەیش فشار خستنە سەر بەشداربووەكانە تا بەزووی مامەڵەكانیان جێبەجێ بكەن وكۆمپانیا پارەكانی وەربگرێتەوە، بۆیە مۆڵەتی (٢٤) كاژێریان پێدەدات كە دەكاتە (٥) ی ئێوارە بەكاتی ئەمەریكا و (١١) ی شەو بە كاتی گرێنتش خۆ ئەگەر بەشداربوو لەو ماوەیەدا حسابەكەی سفر نەكردەوە ئەوە دەبێت ئەو بڕە پارەیە بداتە كۆمپانیا، نرخی ئەو بڕە پارەیەیش لە كۆمپانیایەك بۆ كۆمپانیایەك و دراوێك بۆ دراوێكی تر دەگۆڕێت بەپێی نرخی ئەو سووەی كە بانكی ناوەندی هەر وڵاتێك لەسەر دراوە نێوخۆییەكەی دیاری دەكات.

هەر چەندە هەندێك لەكۆمپانیاكان لە ئێستادا و لەبەر ئەوەی كەپێیان گوتراوە ئەمە سوویەكی ئاشكرایە و لەپێناو ئەوەی بەشداربووە موسوڵمانەكانیان لەدەست نەدەن خۆیان لە جێبەجێكردنی ئەم مەرجە دەپارێزن و بەر لە ماوەی دیاریكراو بۆ داخستنی ئەكاونتی بەشداربووەكان خۆیان ئەكاونتەكان دادەخەن و جارێكی تر بۆیان دەكەنەوە تا ماوەكەیان بۆ تازە بێتەوە. یان هەندێك كەس و بەمەبەستی خۆ پاراستن لەو مەرجە هەوڵ دەدەن لەهەمان ڕۆژدا حیسابەكەیان سفر بكەنەوە تا تووشی ئەو سووە نەبن.

بەڵام هیچ كام لەمانە بەس نین بۆ شەرعیبوونی مامەڵەكە لەبەر دوو هۆكار:

أ- بوونی خودی مەرجەكە گرێبەستەكە حەرام دەكات ئەگەریش نەڕواتە بواری جێبەجێكردنەوە.

ب- ئەگەر كۆمپانیایش ئەو مەرجە لەسەر بەشداربوو لا بەرێت، ئەوا مەرجەكە لەنێوان كۆمپانیا و ئەو لایەنەی پارەكە دەدات هەر دەمێنێت.

زانایانی هەر چوار مەزهەبەكەیش هاوڕان لەسەر ئەوەی كە هەر گرێبەستێك ئەو جۆرە مەرجانەی تێدا بێت جگە لەوەی كردنی حەرامە، گرێبەستەكەیش دانامەزرێ وهەڵدەوشێتەوە، یان بەلای كەمەوە پێویستە مەرجی دانانی سزای سووەكە هەڵبوەشێتەوە، وئەمەیش دەقی قسەكانیانە لەو بارەیەوە.

حەنەفیەكان دەڵێن: (وإدخال الربا في العقد يفسد العقد كله)[٤٠]. واتا: دانانی سوو لەگەرێبەستدا هەموو گرێبەستەكە پوچەڵ دەكاتەوە وتێكی دەدات.

مالیكییەكانیش لەو بارەیەوە دەڵێن: (وكل بيع حرام لا يقر على حال إن أدرك رد)[٤١]. واتا: هەر مامەڵەیەكی حەرام بەهیچ شێوەیەك ڕێگەی پێ نادرێت ودەبێت هەڵبوەشێتەوە.

شافعییەكان دەڵێن: (وتعاطي العقود الفاسدة حرام في الربوي وغيره)[٤٢]. واتا: ئەو گرێبەستانەی پوچ و وبەتاڵن بەهۆی بوونی سوو یان هەرشتێكی ترەوە ئەنجامدانیان حەرامە. هەروەها دەڵێن: (العقد إذا وقع فاسدا لا يصح بزوال ما وقع به فاسدا)[٤٣]. واتا: هەر گرێبەستێك بە خراپی ویەتاڵی دامەزرا، بەلادانی ئەو مەرجەی كە بەتاڵی كردۆتەوە دروست نابێت.

حەنبەلییەكانیش دەڵێن: (ويحرم تعاطيهما عقدا فاسدا من بيع أو غيره (فلا يملك) المبيع ونحوه (به) أي بالعقد الفاسد؛ لأن وجوده كعدمه)[٤٤]. واتا: حەرامە گرێبەستێك ئەنجام بدەن كە بەتاڵە، گرێبەستەكە كڕین وفرۆشتن بێت یان هەرشتێكی تر و كڕیار نابێتە خاوەنی فرۆشراوەكە بەو گرێبەستە بەتاڵە؛ چونكە بوون ونەبوونی ئەو جۆرە گرێبەستانە وەك یەك

---

٤٠ – الكاساني (علاء الدين أبو بكر بن مسعود)، بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع، ج٥، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤٠٦،١٩٨٦، ص٢٥٧.

٤١ – مالك (مالك بن أنس)، المدونة الكبرى، ج٣، دار الكتب العلمية، بيروت، ص٣٣٨، تحقيق: زكريا عميرات.

٤٢ – إبن حجر الهيتمي (أحمد بن محمد بن علي)، تحفة المحتاج في شرح المنهاج، ج٤، المكتبة التجارية الكبرى، مصر، ط١٩٨٣، ص٢٩١. الخطيب الشربيني، مغنى المحتاج الى معرفة معاني الفاظ المنهاج، ج٤، مطبعة مصطفى البابي الحلبي وأولاده، مصر، ص٨٤.

٤٣ – الماوردي، الحاوي الكبير في فقه الشافعي، ج٦، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٩٤، ص٤٩٣.

٤٤ – البهوتي (منصور بن يونس البهوتي)، كشاف القناع عن متن الإقناع، ج٥، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤١٨، ١٩٩٧، ص٢٨٤، تحقيق: محمد حسن محمد حسن.

**وایە. هەروەها دەڵێن: (المقبوض بالعقد الفاسد یجب فیه التراد من الجانبین)[٤٥]. ئەو شتانەی بەهۆی گرێبەستێکی پوچەوە وەرگیراون، پێویستە هەردوو لایەنی گرێبەستکە بۆ یەکتری بگێڕنەوە.**

**زەفترین بەڵگەی زانایانیش لەم بۆچوونەیاندا ئەو فەرموودەیەیە کە ئەبو سەعیدی خدری بۆمان دەگێڕێتەوە ودەڵێت: (جاء بلال إلى النبي ﷺ بتمر برني فقال له النبي ﷺ: {من أين هذا}؟. قال بلال: كان عندنا امر رديء فبعت منه صاعين بصاع لنطعم النبي فقال النبي ﷺ عند ذلك: {أوه أوه عين الربا عين الربا لا تفعل ولكن إذا أردت أن تشتري فبع التمر ببيع آخر ثم اشتره}[٤٦]. واتا: بیلال خورمایەکی بەرنی بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ هێنا، پێغەمبەری خودا ﷺپێی فەرموو: ئەمەت لەکوێ بوو؟. بیلال گوتی: خورمایەکی خراپمان هەبوو چووم هەشت مشتم لەو خورما خراپە دا بەچوار مشت لەم خورمایە بۆ ئەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ لێی بخوات، پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموو: ئۆە ئۆە چیت کردوە ئەوە خودی سووە خودی سووە، شتی وانەکەیت، ئەگەر وویستت لەم خورمایە بکڕیت، خورماکەی خۆت بفرۆشە، دواتر ئەم خورمایە بکڕە. ئیمامی نەوەوی لەڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێت: (دليل على أن المقبوض ببيع فاسد يجب رده على بائعه وإذا رده استرد الثمن)[٤٧]. واتا: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەر کڕدراوێك لە مامەڵەیەکی پوچدا دەبێت بگێڕدرێتەوە، وکە گەڕایشەوە پارەکەی وەردەگیرێتەوە.**

**جا بەڕێزان هەموو ئەمانەی باسمان کرد بەڵگەی ڕوون وئاشکران لەسەر بەتاڵی و پووچی هەر مامەڵەیەك کە سووی تێدابێت، ئیتر سووەکە بدرێت یان نا ئەوە بابەتێکی ترە، بۆیە نەدانی سووەکە هەرگیز نابێتە پاساوی شەرعی بۆ کردنی مامەڵەکە کە لە بنەڕەتدا سووی تێدایە.**

---

٤٥ – إبن تيمية (أحمد بن عبد الحليم)، إقتضاء الصراط المستقيم في مخالفة أصحاب الجحيم، ج٢، ط٧، دار عالم الكتب، بيروت، ١٤١٩،١٩٩٩، ص٤٧، تحقيق: ناصر عبد الكريم العقل.

٤٦ – مسلم، صحيح مسلم، ج٣،ص١٢١٥، رقم الحديث (١٥٩٤).

٤٧ – النووي (يحيي بن شرف النووي)، شرح النووي على صحيح مسلم (المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج)، ج١١، دار إحياء التراث العربي، بيروت، ط ١٣٩٢، ص٢٢.

بەداخەوە لە ئێستادا زۆرێك لەموسوڵمانان دەچن بەشداری لەكۆمەڵێك گرێبەستدا دەكەن كە بە ئاشكرا مەرجی سوو و سزای دواكەوتنی دانەوەی گوژمەكانی تێدایە و خۆیان بەوە هەڵدەخەڵەتێنن كە ئەوان بەمەرجەكانی كۆمپانیاوە پابەند دەبن و ناهێڵن ئەو مەرجانە بێنە دی، بێ ئاگا لەوەی هەر خودی بوونی مەرجەكە گرێبەستەكە حەرام دەكات و بەڵگەكانیشمان لەو بارەیەوە خستە ڕوو.

٤- دەلاڵی: بریتییە لەو بڕە پارەیەی كە ڕێژەیەكی سەدییە لەنرخی كڕین یان فرۆشتنی كاڵاكە و دەبێت بەشداربوو بیداتە ئەو كۆمپانیا نێوەندگیرەی كەلەڕێگەیەوە مامەڵەكانی جێبەجێ دەكات.

٥- بارمتە (رهن): بریتییە لە پاراستن و هێشتنەوەی كۆی كاڵاو گرێبەستەكە لای كۆمپانیای نێوەندگیر لە بارمتەی ئەو پارانەی كە كۆمپانیا خستویەتییە سەر هەبووی بەشداربوو؛ بۆیە ئەگەر بەشداربوو زیانی كرد لە مامەڵەكەدا ئەوە كۆمپانیا لە پارەكانی بەشداربوو خۆی بڕی زیانەكە دەردەكات و پاش ئەوەی شایستە داراییەكانی خۆی لێ دەردەكات ئەگەر شتێكی لێمایەوە بۆ بەشداربووی دەگێڕێتەوە هەر بۆیە خاوەندارێتی كەسی بەشداربوو تەنها ناوەو تا شایستە داراییەكانی كۆمپانیا نەگێڕێتەوە مافی خاوەندارێتی كاڵاكەی زۆر سنووردارە.

## تەوەری چوارەم:
## سرووشتی شەرعی مامەڵەکە

ئەوەی گرنگە و خاڵی هەرە ئاڵۆزی مامەڵەکەیە سروشتی ئەو بڕە پارەیەیە کە کۆمپانیا یان بانك دەیخاتە سەر هەبووی بەشداربوو کە بەپێی پێوەرە شەرعییەکان لەیەکێك لەم گریمانانە دەرناچێت:

١. قەرز بێت: ڕاستە ئەو پارەیەی کۆمپانیای نێوەندگیر دابینی دەکات لەسرووشتی قەرزدایە بەڵام قەرزێکی شەرعی نییە و مەبەست لێی چاکەکاری و ڕەزامەندی خوای گەورە نییە بەڵکو قەرزێکەو بەسوو دەدرێت ئەمیش بەهۆی ئەوەی کە:

أ- قەرزی چاکەکاری نابێت هیچ سوودێکی مادی بۆ خاوەن قەرزەکە بگەڕێتەوە، بەڵام لەم گرێبەستەدا کۆمپانیا لە بری ئەو قەرزەی دەیداتە بەشداربوو سوود وەردەگرێت ولەبری هەر گرێبەستێکدا (٣٥$) وەردەگرێت ئەوە جگە لەباجی جێگیرکردن و سوودی گۆڕینەوەی دراوەکان.

ب- ئەگەر قەرزێکی چاکەکاری بووایە دەبو بەشداربوو ببێتە خاوەنی ڕاستەقینەی کاڵاکە و خۆی مافی ڕاستەوخۆی بەکارهێنانی کاڵاکەی هەبێت و مافی خاوەنداریێتی سنووردار و ڕوکەش نەبێت.

ت- ئەگەر قەرزی چاکەکاری بووایە نەدەبوو کۆمپانیای نێوەندگیر مافی فرۆشتنی کاڵاکەی پێ بدرێت بەبێ گەڕانەوە بۆ ڕای بەشداربوو کە بەناو خاوەنی ڕاستەقینەی کاڵاکەیە.

٢.(مضاربة) بێت: ئەم مامەڵەیە (مضاربة) یش نییە چونکە:

أ-سرووشتی (مضاربة) وایە کە یەکێك لەلایەنەکانی گرێبەستەکە کار دەکات و لایەنەکەی تر پارە دەدات، بەڵام لەم مامەڵەیەدا هەردوو لایەنی گرێبەستەکە پارە دەدەن و هەردووکیشیان کار دەکەن.

ب- لە (مضاربة) دا ئەگەر قازانجێك هەبوو ئەوە لایەنەکانی گرێبەستەکە پێکەوە بەڕێژەیەك کە لەسەری ڕێکەوتون دابەشی دەکەن، ئەگەریش زەرەریان کرد ئەوە خاوەن دەستمایەکە زەرەری پارەکە دەکات و خاوەن کارەکەیش ماندووبوونەکەی زەرەر دەکات،

بەڵام لەم گرێبەستەدا هەموو زەرەرەكە بەر خاوەن كارەكە دەكەوێت كەبڕێك پارەی كەمی هەیە لە مامەڵەكەدا و خاوەن دەسمایەی ڕاستەقینە كە كۆمپانیایە هیچ زەرەرێك نادات.

٣.هاوبەشی (شراكة) بێت: ئەم گریمانەیەیش دیسان ڕاست نییە، چونكە لەگرێبەستی هاوبەشبووندا هەردوو لایەنی گرێبەستەكە لە قازانج و زەرەردا بەشدار دەبن بەو ڕێژەیەی لەسەری ڕێكەوتوون، بەڵام لەم جۆرە گرێبەستەدا كۆمپانیا ڕێژەیەك پارەی دیاریكراو وەردەگرێت وهیچ پەیوەندی بەقازانج و زەرەری مامەڵەكەوە نییە.

٤.بەخشین (هبة) بێت: ئەگەر گریمان ئەو پارەیەی كۆمپانیا دەیداتە كەسی بەشداربوو بەخشین بێت ئەمەیش ڕاست نییە؛ چونكە ئەگەر بەخشین بوایە دەبوو بەشداربوو ببێتە خاوەنی ڕاستەقینەی بەخشراوەكە و بە ئارەزووی خۆی مامەڵەی پێوە بكات بەڵام لەم گرێبەستەدا بەشداربوو نابێتە خاوەنی یەك سەنتی پارەی كۆمپانیا و وتەنها لەسنوورێكی زۆر بەرتەسكدا نەبێت مافی مامەڵە پێوەكردنیشی نییە و لەكاتی ڕوودانی هەر زیانێكدا دەبێت قەرەبووی كۆمپانیا بكاتەوە، هیچ كام لەمانەیش لەگەڵ سروشتی بەخشین یەك ناكەنەوە.

٥.(رهن) بارمتە بێت: ئەم گریمانەیەیش دیسان هەڵەیە؛ چونكە لە بارمتەی شەرعییدا لایەنی خاوەن پارە كاڵایەك لە بارمتەی قەرزەكەیدا وەردەگرێت بەڵام نابێت بۆ بەرژەوەندی خۆی بەكاری بهێنێت یان هیچ سوودێكی لێ ببینێت، بەڵام لەم گرێبەستەدا كۆمپانیا بەچەندین شێوە و لەچەندین ڕووەوە سوود لەكاڵاكان وەردەگرێت كە ئەمەیش دیسانەوە بە سوو ئەژمار دەكرێت.

٦.(سلم) بێت: ئەم گریمانەیەیش دیسان ڕاست نییە، چونكە لە (سلم) دا:

أ- نابێت لە پارەدا یان لەئاڵتون و زیو یان لەهەر شتێكی تر كە حوكمی ئەوانی هەیە لەنموونەی كۆمپیالە و قەواڵەی دارایی وچەكی بانكیدا بكرێت، وە كڕین و فرۆشتنی هەر یەك لەوانە بەپارە دەبێت و دەبێت دەستاو دەست بێت و ئەمەیش بەهیچ شێوەیەك لە فۆرێكسدا ڕوو نادات.

ب- خاڵێكی تری جیاوازی نێوان ئەم مامەڵەیە و (سلم) ئەوەیە كە (مسلم فیە) واتە شتە كڕدراوەكە هەتا وادەی ڕادەستكردنی نەیەت و ڕادەستی كڕیارەكە نەكرێت دروست

**نییە مامەڵەی پێوە بكرێت، بەڵام لە بازاڕی فۆرێكسدا شتە كڕدراوەكان چەندین جار دەستاو دەست دەكەن و بەدەگمەنیش حاڵەتی ڕادەستكردن ڕوودەدات، چونكە وەك پێشتریش گوتمان ئامانجی هەموو كڕیارەكان سوود وەرگرتنە لە قازانجی بەرزو نزمكردنی دراوەكان نەك كڕینی خودی دراوەكان یان كاڵاكان، هەر بۆیە ئەم مامەڵەیە (سلم) یش نییە و حوكمی (سلم) وەرناگرێت.**

## تەوەری پێنجەم
## حوكمی شەرعیی كاركردن لە (Forex) و بازرگانی (Margin) دا

**وەك لەتەوەری پێشوودا ئاماژەمان پێدا ئەم مامەڵەیە لەگەڵ هیچ كام لە مامەڵە شەرعییەكان یەك ناكاتەوە و جیاوازی هەیە، ئەو جیاوازیانەیش نەرێنین و هۆكارن بۆ حەرامی مامەڵەكە، لەگرنگترینی ئەو جیاوازیانەیش:**

**١- ئەم مامەڵەیە بەو شێوەیەی باسمان كرد دوو جۆر سووی تێدایە:**

**أ- سووی زیادەی قەرز: كە بریتییە لەوەی شتێك بە كەسێك بدەیت بەقەرز و لەبەرامبەردا مەرجی زیادە یان هەر سوودێكی تری لەسەر دابنێیت، هەر مامەڵەیەك ئەو مەرجەی تێدا بێت بە كۆی دەنگی زانایان حەرامە.**

**ئەو پارەیەیش كە بەناوی (leverage) وە كۆمپانیا دەیخاتە سەر هەبووی بەشداربوو لەسرووشتی قەرزدایە وكۆمپانیا لەسێ ڕووەوە قازانجی لێ دەكات:**

- **كۆمپانیا مەرجی ئەوە لەسەر بەشداربوو دادەنێت كە دەبێت هەموو مامەڵە داراییەكانی لەڕێگەی ئەووەوە بێت وئەویش بۆ هەر مامەڵەیەك ڕێژەیەك پارە وەردەگرێت.**
- **(رسوم التثبیت) باجی جێگیربوون كەپێشتریش باسمان كرد هەر بەشداربوویەك لەهەمان ڕۆژدا حیسابەكەی سفر نەكردەوە ئەوە دەبێت بڕێك پارە بداتە كۆمپانیا.**

- (Spread) کە بریتییە لە جیاوازی نرخی دراوەکان لەکاتی کڕین و فرۆشتندا. زانایانیش بەکۆی دەنگ پێیان وایە هەر مامەڵەیەك ئەم جۆرە سوودەی تێدا بێت حەرامە.

(إبن عبد البر) دەربارەی ئەو جۆرە مامەڵانە دەڵێت: (وكل زيادة من عين أو منفعة يشترطها المسلف على المستسلف فهى ربا لا خلاف فى ذلك)[٤٨]. واتا: هەر زیادەیەك خاوەن قەرزەکە بیکات بەمەرج بەسەر قەرزارەکەوە جا زیادەکە شتێکی بەرجەستەبوو بێت یان مەعنەوی بێت ئەوە بەکۆی دەنگ بەسوو ئەژمار دەکرێت. إبن تیمیەیش دەڵێت: (وقد اتفق العلماء على أن المقرض متى اشترط زيادة على قرضه كان ذلك حراما)[٤٩]. واتا: زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی هەرکات خاون قەرز مەرجی وەرگرتنەوەی زیاد لەقەرزەکەی دانا ئەوە حەرامە. إبن قدامەیش دەڵێت: (وكل قرض شرط فيه أن يزيده فهو حرام بغير خلاف)[٥٠]. واتا: هەر قەرزێك مەرجی وەرگرتنەوەی زیادەی تیا دانرا ئەوە بەکۆی دەنگ حەرامە[٥١]. کۆمکاری فیقهی ئیسلامییش لە بارەی ئەو جۆرە سوودەوە دەڵێت: (إن كل زيادة أو فائدة على الدين الذي حل أجله وعجز المدين عن الوفاء به مقابل تأجيله، وكذلك الزيادة أو الفائدة على القرض منذ بداية العقد. هاتان الصورتان ربا محرم شرعا)[٥٢]. واتا: هەر زیادەیەك یان سوودێك لەبەرامبەر درێژکردنەوەی ماوەی ئەو قەرزە دابنرێت کەکاتی دانەوەی هاتووە و قەرزارەکە ناتوانێت بیداتەوە یان هەر لەسەرەتای گرێبەستەکەوە مەرجی زیادە دابنرێت هەردوو شێوەکە سووە و لەشەرعدا حەرامە.

خۆ ئەگەر بەشداربوو لە سنووری هەبووە داراییەکانی خۆیدا مامەڵە بکات و قەرز وەرنەگرێت لە کۆمپانیا نێوەندگیرەکان ئەو کات کێشەی ئەم جۆرە سووەی بۆ دروست نابێت.

---

٤٨ - إبن عبد البر(يوسف بن عبد الله)، الإستذكار، ج٦، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ص٥١٦، تحقيق: سالم محمد عطا، محمد علي معوض.

٤٩ - إبن تيمية، مجموع الفتاوى، ج٢٩،ص٣٣٤.

٥٠ - إبن قدامة، المغني، ج٦، ص٤٣٦.

٥١ - بۆ زانیاری زیاتر لەو بارەیەوە بڕوانە: الكاساني، بدائع الصنائع، بيروت، دار الكتاب العربي، ١٩٨٢م، ط٢، ج٧، ص٣٩٥. كمال الدين محمد بن عبد الواحد السيواسي، شرح فتح القدير، بيروت، دار الفكر، ط٢، ج٧، ص٢٥١. الحطاب، مواهب الجليل شرح مختصر خليل، بيروت، دار الفكر، ١٣٩٨هـ، ط٢، ج٤، ص٥٤٦. زكريا بن محمد بن أحمد الأنصاري، فتح الوهاب، بيروت، دار الكتب العلمية، ١٤١٨هـ، ط١، ج١، ص٣٢٧. إبن قدامة، المغني، بيروت، دار الفكر، ١٤٠٥هـ، ط١، ج٤، ص٢١١.

٥٢ - مجلة المجمع، ع٢، ج٢، ص٧٣٥ و٨١٣. القرار رقم (١٠ ) (٢/١٠).

ب- سووی ئامادەنەبوونی یەکێك لە دراوەکان (ربا النسيئة): یەکێك لەمەرجە سەرەکییەکانی دروستی ئاڵوگۆڕکردنی دراو یان کڕینی ئاڵتون و زیو لەڕوانگەی شەرعەوە ئامادەبوون و دەستاودەستکردنی دراوەکانە یان ئاڵتون و زیوەکەیە لەکاتی مامەڵەکردندا، ئەم مەرجەیش هیچ کات لەبازاڕی فۆرێکسدا کە تایبەتە بە ئاڵوگۆڕکردنی دراو ڕوونادات؛ چونکە وەکو پێشتریش گوتمان خودی مامەڵەکە و بڕی پارەکەی بەناوی کۆمپانیای نێوەندگیرەوە تۆمار دەکرێت و کەسی بەشداربوو تەنها بەڕوکەش و لەپەراوێزدا خاوەنداریێتی دەکات و هیچ کات کۆمپانیا ئامادە نییە دراوە کڕدراوەکان یان ئاڵتونەکان ڕادەستی بەشداربو بکات، بەڵکو لەبارمتەی قەرزەکەیدا لای خۆی گل دەداتەوە.

(إبن المنذر) لەو بارەیەوە دەڵێت: (أجمع كل من نحفظ عنه من أهل العلم أن المتصارفين إذا افترقا قبل ان يتقابضا أن الصرف فاسد)[٥٣]. واتا: هەموو ئەو کەسانەی کەزانستیان لێوە فێربووین کۆدەنگن لەسەر ئەوەی لەکاتی ئاڵوگۆڕکردنی دراودا ئەگەر مامەڵەکاران جیابوونەوە بەر لەوەی پارەکانییان وەربگرن مامەڵەکەیان دروست نییە[٥٤].

٢- ئەم مامەڵەیە لەیەك کاتدا قەرزو مەرجیش لەخۆ دەگرێت وئەمەیش لە شەرعدا دروست نییە: بۆ نموونە تۆ پارەیەك بە کەسێك دەدەیت بەو مەرجەی کاڵا و کەرەسە لەخۆت بکڕێت، ئەم قەرزو مەرجە دروست نییە، لێرەشدا کۆمپانیا بە مەرجی ئەوە قەرز دەداتە بەشداربوو کە دەبێت هەموو مامەڵە داراییەکانی لەڕێگەی خۆیەوە بێت، پێغەمبەری خودایش ﷺ نەهی کردووە لەمامەڵەیەك کەقەرزو مەرج لەخۆ بگرێت. حەطاب لە ڕاڤەی ئەو فەرموودەیەدا دەڵێت: (واعلم أنه لا خلاف في المنع من صريح بيع وسلف)[٥٥]. واتا: بزانە کە زانایان کۆدەنگن لەسەر ڕێگرتن لەهەر مامەڵەیەك کە قەرز و فرۆشتن کۆبکاتەوە. کۆمکاری فیقهی ئیسلامییش لەو بارەیەوە دەڵێت: (أن اشتراط الوسيط على العميل أن تكون تجارته عن طريقه، يؤدي إلى الجمع بين سلف ومعاوضة ( السمسرة )، وهو في معنى الجمع بين سلف

---

٥٣ - إبن قدامة، المغني، ج٤، ص٤١.

٥٤ - بۆ زانیاری زیاتر لەو بارەیەوە بڕوانە: مجلة مجمع الفقه الإسلامي الدولي، العدد السادس، ج١، ص٤٥٣، د. علي محيي الدين القره داغي، أحكام المتاجرة في العملات، بحث غير منشور، ص٧٨، هيئة المحاسبة والمراجعة للمؤسسات الإسلامية، المعايير الشرعية ١٤٢٨هـ-٢٠٠٧م، المعيار الأول المتاجرة بالعملات، ص٥، والمعيار ١٨، ص٣٠٥.

٥٥ ـ الحطاب، مواهب الجليل، ج٦، ص٢٧١.

وبيع ، المنهي عنه شرعا في قول الرسول ﷺ: ( لا يحل سلف وبيع ...[٥٦])[٥٧]. واتا: مەرج دانانی كۆمپانیای نێوەندگیر لەسەر بەشداربوو كە دەبێت لەڕێی خۆیەوە بازرگانی بكات، دەبێتە هۆكاری كۆكردنەوەی قەرز و ئاڵوگۆڕ لەیەك مامەڵەدا، ئەویش هەمان واتا و حوكمی كۆبونەوەی قەرز و فرۆشتنی هەیە كە لە شەریعەتدا ڕێگەی پێنەدراوە بەبەڵگەی ئەو فەرموودەیەی كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (فرۆشتن و قەرز لەیەك مامەڵەدا دروست نییە).

بۆیە وەك لەخاڵی پێشوشدا باسمان كرد ئەگەر بەشداربوو لە سنووری هەبووە دارایيەكانی خۆیدا مامەڵە بكات و قەرز وەرنەگرێت ئەو كات ئەم كێشەیەیشی بۆ دروست نابێت.

٣- ئەم مامەلآنە تەنها ڕواڵەتین و لەواقیعدا بوونییان نییە: چونكە كۆمپانیای نێوەندگیر قەرزێك دەداتە بەشداربوو كەهەبووی ڕاستەقینەی نییە، بەشداربوویش مامەڵە بەشتێكەوە دەكات كەئەم خاوەنی ڕاستەقینەی نییە و سنووری دەسەڵاتی دیاریكراوە، دەستاودەست كردنی كاڵاكانیش هەر بوونیان نییە، ئەمانە تەنها ناو و ژمارەو شتی ڕواڵەتین و سەرجەم بەشداربووان و كۆمپانیا نێوەندگیرەكان و دامەزراوە دارایيەكانیش ئەو ڕاستییە دەزانن كە ئامانجی كەسیان كڕینی دراو نییە بەڵكو بۆ بەشداربووان  سوود وەرگرتنە لە جیاوازی نرخی دراوەكان و بۆ كۆمپانیاكانیش دەستخستنی ئەو سووانەیە كەلەڕێی قەرزەكانیانەوە بەدەستیان دەگات، بۆیە لەم مامەلآنەدا پارە لەئامراز دەردەچێت و دەبێتە ئامانج.

٤- ئەو كۆمپانیایانەی بەشداربووان لەڕێی فۆرێكسەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەكەن، زۆرێكیان داهات و دەستمایەكانییان لە پرۆژەی حەرام و ڕێگەپێنەدراودا بەكاردەهێنن لەوانە بواری بازرگانی بە ئارەق و گۆشتی بەرازو سو و مامەڵەكردن بە قەواڵە دارایيەكان و گرێبەستە داهاتوو پێشبینیكراوەكان و هتد. هاوبەشی كردن و مامەڵەكردن و وەبەرهێنانیش لەگەڵ هەر

---

٥٦ - أبو داود (سليمان بن الاشعث السجستاني)، سنن أبي داود، ج٣، دار الفكر، بيروت، ص٢٩٨، تحقيق: سعيد محمد اللحام. الترمذي (محمد بن عيسى)، سنن الترمذي، ج٣، دار إحياء التراث العربي، بيروت، ص٥٣٥، تحقيق أحمد محمد شاكر وآخرون، وقال: حديث حسن صحيح.

٥٧ - مجلة مجمع الفقه الإسلامي الدولي، العدد السادس، ج١، ص٤٥٣،

كۆمپانیایەك كە لەیەكێك لەو بوار و كەرتانەدا كار بكات و وەبەرهێنان بكات دروست نییە. كۆمكاری فیقهی ئیسلامی لە خولی (١٤) ی ساڵی (١٤١٥) لەو بارەیەوە دەڵێت: (بازرگانیكردن لەگەڵ ئەو كۆمپانیایانەی كەبنەمای بازرگانییەكەییان حەرامە یان هەندێك لەمامەڵەكانی سووی تێدایە حەرامە و درووست نییە)[٥٨].

٥- خیانەتو فێڵ و فۆرخكاری و دەستبڕین: بەپێی ئامارەكان و دانپێدانانی ئەو كۆمپانیاو دامەزراوە داراییانەی كە لەم بوارەدا كاردەكەن لە (٩٥٪) ی ئەو بەشداربووانەی لەم جۆرە بازاڕو پڕۆژانەدا دەیانەوێت وەبەرهێنان بكەن نەك هەر قازانج ناكەن بەڵكو دەستمایەكانیشیان لەدەست دەدەن و مایەپووچ دەبن؛ چونكە زۆربەی زۆری ئەو كۆمپانیاو دامەزراوانە خاوەنی دەسمایەیەكی بێشومارن و دەتوانن بە ئاسانی یاری بەنرخی دراو وكاڵاكان بكەن و كاریگەرییان لەسەر دروست بكەن، هەر بۆیە كاتێك دەزانن بەشداربووەكان ڕێژەیەكی زۆریان لەجۆرێكی دراو كڕیوە بەهیوای قازانج و بەرزبوونەوەی نرخی دراوەكە، ئەوان یەكسەر دێن وڕێژەیەكی زۆر لەو دراوە دەخەنە بازاڕەوە و بەمەیش نرخی دراوەكە بەشێوەیەكی بەرچاو دێتە خوارەوە و زیانی بەشداربووەكان ئاستی ڕێگەپێدراو تێدەپەڕێنێت و یەكسەر و بەبێ ئاگای خۆیان دراوەكانیان بەزەرەر دەخرێتە بازاڕەوەو بەمەیش ئەوەندەی تر نرخی دراوەكە دادەبەزێت و ئەكاونتی بەشدابووەكان دادەخرێت و پارەكانییان تیا دەچێت، بەم شێوەیەیش كۆمپانیاكان دەست بەسەر حسابی هەزارەها بەشداربوودا دەگرن و پارەكانیان بۆ خۆیان دەبەن و پاش ماوەیەكیش كە نرخی دراوەكە تەواو دادەبەزێت هەر ئەو كۆمپانیایانە خۆیان ڕێژەیەكی زۆری لێدەكڕن و بەمەیش دیسانەوە نرخی دراوەكە یان كاڵاكە بەرز دەبێتەوە و جارێكی تر كۆمەڵێك بەدبەختی تر كە دەبینن نرخی ئەو دراوە لە هەڵكشاندایە دەچن دەیكڕن و دواتر ئەوانیش بەدەردی پێشینەكانیان دەچن و بەم شێوەیەیش ئەم سیناریۆیانە دەیەها وسەدەهاو هەزارەها جار دووبارە دەبنەوە و هەر جارێك سەری كۆمەڵێك دەخوات و هەمیشە قوربانییەكانیش لە چینی بەشداربوو و خاوەن دەستمایە كەمەكانن كەناتوانن كاریگەری لەسەر نرخی دراو و كاڵاكان دروست بكەن و تاكە لایەنی براوەیش

٥٨ - المصدر نفسه،

كەهەمیشە قازانج دەكات و هەرگیز زیان ناكات ئەو كۆمپانیا و دامەزراوە داراییانەن كەبەو شێوەیە یاری بەنرخی دراو و كاڵاو چارەنووسی بەشداربووەكانیان دەكەن.

لەو بارەیەوە ئابووریناسان دەڵێن مامەڵە كردن بەم سیستەمە هۆكاری سەرەكی داڕووخانی بۆرسەی نیۆیۆرك بوو ئەویش بەهۆی ئەوەی كە فەرمانێكی زۆر لەكۆمپیوتەری كۆمپانیا نێوەندگیر و دەڵاڵەكاندا داتاكرابوو بە ساغكردنەوە و خستنە بازاڕی دۆلار لەكاتی دابەزینی بۆ ڕێژەیەكی دیاریكراو، پاش دابەزینی نرخەكان بۆ ئەو ڕێژەیە سەرجەم ئەو پشكانە خرانە بازاڕەوە بەبێ ئەوەی كەس خواستی لەسەر كڕینی هەبێت ئەمەیش بوو بەهۆی داڕمانی بۆرسەكە.

فێڵ و دەستبڕین و قۆرخكارییش لەهەر مامەڵەیەكدا هەبێت بەدڵنیاییەوە حەرامە.

٦- ئەم جۆرە مامەڵە و بازرگانییە زیانێكی زۆر بەداهات و سەروەتی نیشتیمانی و گوزەرانی هاوڵاتییان دەگەیەنێت و پارە لەبازاڕەكاندا ناهێڵێت و پڕۆژەكان پەك دەخات و ژێرخانی ئابووری و ئاوەدانكردنەوە وێران دەكات و ڕێژەی بێكاری زیاد دەكات و دراوەكان لە ئامڕازێكەوە بۆ دەستەبەركرنی پێداویستییەكان و بەگەڕخستنی تواناكان دەكاتە ئامانج و خودی پارە دەبێتە چەقی وەبەرهێنان و كۆمەڵێك كۆمپانیای وەهمی دەستی بەسەردا دەگرن و تەحەكومی پێوە دەكەن.

٧- قۆرخكردنی پارە و قەتیسكردنی لەدەستی كۆمەڵێك دەوڵەت وكۆمپانیاو دامەزراوەی داراییدا: چونكە دراوی سەرەكی لەم بازاڕەدا كە دەبێتە پێوەر بۆ هەموو دراوەكانی تر دۆلاری ئەمریكییە و هەر بەشداربوویەكیش بیەوێت پارەكانی بكێشێتەوە لەم بازارە دەبێت پارەكانی بەهەر دراوێك بن بیانكاتەوە بە دۆلاری ئەمریكی و ئەوجا ڕایبكێشێتەوە ئەم سیاسەتەیش ڕوون ئاشكرایە كە تەنها خزمەت بە دراو و ئابووری وڵاتێكی دیاریكراو دەكات لەسەر حیساب و بەرژەوەندی وڵاتانی تر.

هەر بۆیە ئەم جۆرە مامەڵانە لەڕوی (شەرعیی، یاسایی، ئابورییە)ەوە گرفت و مەترسی زۆریان هەیە و بەهیچ شێوەیەك دروست نییە لەو ڕێگەیەوە بازرگانی بكرێت.

## كۆتایی

١- لە كۆتایی ئەم توێژینەوەیەدا گرنگترین دەرەنجامەكانی هەر سێ باسەكە بەپێی ڕیزبەندییان دەخەینە ڕوو، لەژێر ڕۆشنایی دەرەنجامەكانیش قسە لەسەر ڕاسپاردەكان دەكەین و سەرەتا لەدەرەنجامەكانەوە دەست پێدەكەین كە ئەمانەن:

٢- كریپتۆ كەرەنسی (Crypto Currency): بریتییە لەپیشەسازی چوارەمی دراوی جیهانی كە دراوێكی ژمارەیی تەشفیركراوە و هیچ حاڵەتێكی فیزیكی و بەرجەستەبووی نییە و لەڕێی هێڵە پێشكەوتووەكانی ئینتەرنێتی دوو بەرهەم دەهێنرێت و پشت بە سیستەمی (Blockchain) دەبەستێت.

٣- هۆكاری سەرەكی سەرهەڵدانی ئەم جۆرە دراوانە دەگەڕێتەوە بۆ كەمكردنەوەی تێچووی حەواڵەو نێوەندگیری هەروەها خۆ قوتاركردن لە چاودێری یاسایی بۆ مامەڵە داراییەكان.

٤- من بەهیچ شێوەیەك دژی سیستەمی دراوی ژمارەیی نیم و پێیشم حەرام نیە بەڵكو بەپێچەوانەوە پێم وایە داهاتوو بۆ دراوی ژمارەیی دەبێت، بەڵام بەپێی پێودانگە شەرعی ویاساییەكان نەك بەرژەوەندی كۆمپانیا وەهمییەكان.

٥- ئەم جۆرە دراوانەی لە ئێستادا بەردەستن سەر بەهیچی دەوڵەت یان دامەزراوەیەكی دارایی خاوەن سەنگ و باوەڕپێكراو نین و دوور لەچاوی یاسا و دەزگاكانی چاودێری دارایی كارو چالاكییەكانیان ئەنجام دەدەن و مەترسییەكی زۆریان لەسەرە و بەهاكانیان زۆر بە خێرایی گۆڕانكارییان بەسەردا دێت، هەر بۆیە زۆرێك لەوڵاتان لە ئێستادا بەتوندی دژایەتی دەكەن ومامەڵە پێوەكردنیان بەیاساغ لەقەڵەم دەدەن.

٦- دراوی (OneCoin) ساڵی (٢٠١٤) لەلایەن دوو كۆمپانیای ئۆفشۆرەوە بەرهەم هێنراوە و لەبنەڕەتدا دراوێكی ئەلكترۆنییە بەڵام لەئێستادا بەكاربەرانی و بەمەبەستی خۆدزینەوە لە چەند پرسێكی شەرعی و یاسایی وای وێنا دەكەن كە تەنها كاڵایەكە و لەچەند پاكێجێكی فێركاری پێك دێت.

٧- ئەگەر(OneCoin) دراو بێت ئەو كات پێویستە لەكاتی مامەڵە پێوەكردنی هەموو مەرجە شەرعییەكانی مامەڵەكردنی دراوی تێدا بێت. ئەگەریش (OneCoin) كۆمەڵێك پاكێجی فێركاری بێت ئەوا لەو ڕووەیشەوە دیسان پێویستە كۆمەڵێك مەرجی شەرعی و یاسایی تێدابێت. كە لە ئێستادا و بەهەردوو گریمانەكە هیچ كام لە مەرجەكانی شەرعیبوونی تێدا نییە.

٨- سەبارەت بە بابەتی بازاڕگەری تۆڕبەندیش (Network Marketing) ئەم بابەتەیش بابەتێكی كۆنی تازەیە و لەمێژە نێوەندە شەرعیی ویاسایی و بازرگانییەكانی بەخۆیەوە سەرقاڵ كردووە و زۆر هەوڵی بنبڕكردنی دەدرێت بەڵام بەداخەوە تا ئێستا وەك دیاردەیەكی دزێو و ئامرازێكی فیڵ و دەستبڕین هەر ماوە و كۆمپانیا لاوازو بێ ئەرزشەكانی دونیای بازرگانی لەپێناو ساغ كردنەوەی كاڵاكانیان و بەدەستهێنانی داهاتی گەورە پەنای بۆ دەبەن.

٩- تا ئێستا زیاتر لە (٧٠٠٠) كۆمپانیای لەم شێوەیە هاتوونەتە بوون و سەرجەمیان پلانی (Ponzi) ساختەكاری پەیڕەو دەكەن لەكارەكانیاندا و سەر بەهیچ دەوڵەتێك یان دامەزراوەیەكی دارایی خاوەن سەنگ و باوەڕپێكراو نین و دوورن لەهەموو چاودێرییەكی شەرعی و یاسایی و دارایی.

١٠- گرنگترین تایبەتمەندییەكانی ئەم جۆرە كۆمپانیایانە بریتین لە: (نەناسراوی وبێ ئەزموونی، سادەیی پرۆژەو كاڵاكانی، هەڵنان وفریودان بەكاری كەم وقازانجی زۆر، دروستكردنی متمانە لەڕێی خەڵكانی ترەوە، بەئامانجگرتنی گشت چینەكانی كۆمەڵگە، هەمەڕەنگی كاڵاكان، بەتۆڕ كاركردن، درۆ و فێڵ و هەڵخەڵەتاندن لە نرخ و كوالیتی كاڵاكان).

١١- سیستەمی كاری كۆمپانیاكانی (Network Marketing) نەك هەر لەگەڵ هیچ مامەڵەیەكی شەرعی یەك ناكاتەوە، بەڵكو چەندین سەرپێچی شەرعیشی تێدایە كە نەك هەموویان بەڵكو هەر یەكەیان بەسن بۆ حەرامبوونی لەوانە: (سووخۆری بەهەردوو جۆرەكەیەوە، فێڵ و درۆ و چاوبەست و چەواشەكاری، قومار و موجازەفە و نادیاری، خواردنی ماڵی خەڵكی بە ناحەق، زیان گەیاندن بە ئابووری نەتەوەیی ونیشتیمانی لەڕێی كوشتنی وزەو توانای ئەندامەكانی و پەكخستنی سەرجەم كەرتە ئابووری و زانستی و پیشەسازی و

كشتوكاڵی و سەربازی و ڕۆشنبیری و وەبەرهێنەكان). هەر بۆیە زۆربەی زانا و كەسایەتی و لیژنە و نێوەندە شەرعییەكان فەتوای حەرامی كاركردنیان لەگەڵ هەر كۆمپانیایەك داوە كە بە سیستەمی (Network Marketing) كار بكات.

١٢- سەبارەت بە بازاڕی (Forex) و بازرگانی (Margin) سەرەتا گرنگە ئەوە بزانین كە مامەڵە كردن و بازرگانی كردن لە ڕێی بۆرسەوە یاخود لەخودی بۆرسەدا هیچ گرفتێكی شەرعی نییە بەمەرجێك مامەڵەكان بەپێی ئەو پێودانگیە شەرعییانە بن كە لە ئابووری ئیسلامییدا باس كراوە و ڕێ وشوێنی بۆ دانراوە.

١٣- بازاڕی فۆڕێكس (Forex): یەكێكە لە هەرە بازاڕە زەبەلاحەكانی دونیا و یەكێك لەتایبەتمەندییەكانی ئەم بازاڕە ئەوەیە كەشوێنێكی دیاریكراوی نییە و شەو ڕۆژ كراوەیە و ڕۆژانە بەبڕی (٣) تریلیۆن دۆلار مامەڵەی تێدا دەكرێت، لەم بازاڕەدا جگە لە دراوی بیانی مامەڵە بە (پشك، قەواڵە، ئاماژە داراییەكان، گرێبستە داهاتووەكان) ەوە دەكرێت.

١٤- یەكێك لە دیارترینی ئەو مامەڵانەی كە لە ڕێی بازاڕی (Forex) ە وە ئەنجام دەدرێت كڕینە بەپەراوێز (الشراء بالهامش) (Margin) : كە تێیدا كەسی بەشداربوو (كڕیار) بڕێكی زۆر كەمی پارەی ئەو دراوە دابین دەكات كە دەیەوێت و بەشی هەرەزۆری نرخەكەی كۆمپانیایەكی نێوەندگیر لەڕێی خۆیەوە یان دامەزراوەیەكی داراییەوە دابینی دەكات بەمەرجێك كۆی گرێبەستەكە بەبارمتە لای كۆمپانیا بمێنێتەوە و خۆی سەرپەرشتی ڕاستەوخۆی مامەڵەكان بكات و مافی ئەوەی هەبێت هەركات مەترسی لەسەر پارەكانی دروست بوو تاك لایەنە و بێ گەڕانەوە بۆ بۆچوونی كەسی بەشداربوو دراوە كڕدراوەكان بفرۆشێت و مامەڵەكە كۆتایی پێ بهێنێت.

١٥- ئەم سیستەمە سیستەمێكی ئاڵۆزەو لەیەك كاتدا چەند مامەڵەیەكی شەرعی لەخۆ دەگرێت یان خاڵی هاوبەشی لەگەڵیان هەیە لەوانە: (بازرگانیكردن، قەرز، باجی جێگیركردن (رسوم التثبيت)، دەلالی، بارمتە (رهن)، مضاربة، هاوبەشی (شراكة)، بەخشین (هبة)، (سلم). و خاڵی هەرە ئاڵۆزی مامەڵەكە ئەو بڕە پارەیەیە كە كۆمپانیا یان بانك دەیخاتە سەر هەبووی بەشداربوو بەناوی(leverage) ەوە كە بەپێی پێوەرە شەرعییەكان سرووشتی قەرزی هەیە.

**١٦- بنەما لەسەر ئەو خاڵانەی كە باسمان كرد چەندین هۆكاری شەرعی هەن بۆ حەرامی مامەڵە كردن بەسیستەمی (Margin) لە ڕێی بازاڕی (Forex) ە وە لەوانە: (سووی زیادەی قەرز، سووی ئامادەنەبوونی یەكێك لە دراوەكان، بوونی قەرزو مەرجیش لەیەك گرێبەستدا، ئەم مامەڵانە تەنها ڕواڵەتین و لەواقیعدا بوونییان نییە، ئەو كۆمپانیایانەی بەشداربووان لەڕێی فۆرێكسەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەكەن، زۆرێكیان داهات و دەستمایەكانییان لە پرۆژەی حەرام و ڕێگەپێنەدراودا بەكاردەهێنن، ئەم جۆرە مامەڵانە خیانەتو فێڵ و فۆرخكاری و دەستبرِینی تێدایە و زیانێكی زۆر بەداهات و سەروەتی نیشتیمانی و گوزەرانی هاوڵاتییان دەگەیەنێت و پارە لەبازاڕەكاندا ناهێڵێت و پرۆژەكان پەك دەخات و ژێرخانی ئابووری و ئاوەدانكردنەوە وێران دەكات و ڕێژەی بێكاری زیاد دەكات و دراوەكان لە ئامرازێكەوە بۆ دەستەبەركرنی پێداویستییەكان و بەگەڕخستنی تواناكان دەكاتە ئامانج و خودی پارە دەبێتە چەقی وەبەرهێنان و كۆمەڵێك كۆمپانیای وەهمی دەستی بەسەردا دەگرن و تەحەكومی پێوە دەكەن. هەر بۆیە ئەم جۆرە مامەڵانە لەڕوی (شەرعیی، یاسایی، ئابورییە)وە گرفت و مەترسی زۆریان هەیە و بەهیچ شێوەیەك دروست نییە لەو ڕێگەیەوە بازرگانی بكرێت.**

**سەبارەت بە ڕاسپاردەكانیش گرنگە:**

**١- هەر كارێك یان پرۆژەیەك دەمانەوێت ئەنجامی بدەین سەرەتا پێویستە لە لایەنە شەرعیی و یاساییەكەی دڵنیا بین، نەك بەپێچەوانەوە كارەكە ئەنجان بدەین و پاشان پرسیاری شەرعیبوونی بكەین.**

**٢- هەر كارێك یان پرۆژەیەكی نوێ و سەردەمییانە دەبێت هەوڵ بدەین لەگەڵ بنەما شەرعییەكان بیگونجێنین نەك بەپێچەوانەوە بنەما شەرعییەكانی لەگەڵ بگونجێنین.**

**٣- بە وریاییەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو كارو پرۆژانە بكەین كەسەرچاوەكانیان جێی گومانن و كۆمپانیای وەهمی و نەناسراویان لە پشتەوەیە بەتایبەتی لەبوارەكانی دراو و تۆڕەكانی بازرگانی ئەلكترۆنی.**

**٤- نێوەندە شەرعی و یاساییەكان بەزووی ئەو جۆرە پرسانە یەكلابكەنەوە كە پرسی هەنووكەیین و بابەتی ڕۆژن و بەدواداچوونی تەواویان بۆ بكەن و لە ڕێی توێژنەوەی زانستییەوە هەڵسەنگاندن بۆ لایەنە ئەرێنی و نەرێنییەكانییان بكەن و دەرەنجامی**

بەدواداچوون و توێژینەوەکانیان سپاردەی لایەنی پەیوەندیدار بکەن و بۆ ڕای گشتی ڕوون بکەنەوە تا خەڵکی بەرچاوڕوونی تەواوی هەبێت لەسەریان بەر لە ئەنجامدانییان.

٥- دەسەڵاتی جێبەجێکردن ڕێکاری یاسایی توند بگرێتەبەر و بەدواداچوون و لێپێچینەوە لەهەموو ئەو کەس و کۆمپانیانە بکات کە لەپێناو بەرژەوەندی بەرتەسکی خۆیاندا و لەڕێی ئەم جۆرە پڕۆژە گوماناوییانەوە زیانیان بە ئابووری وڵات و هاوڵاتیان گەیاندووە و ناچار بکرێن کە قەرەبووی زیانلێکەوتووان بکەنەوە و مافەکانیان بۆ بگێڕنەوە.

لە کۆتاییدا ماوە ئەوە بڵێین کە ئەوەی لەم پەڕتووکەدا لە باشی و ڕاستی هەیە فەزڵی خوایە و گەورەیی و بەخشش و میهری ئەوە، هەر کەموکورتییەکیشی تێدا بێت ئەوە لەمن و نەفس و شەیتانەوەیە و پاك و بێگەردی تەنها بۆ خوایە.

داواکارم لەخوای پەروەردگار بیکاتە توێشوی قیامەتی بەندە و هەر بەڕێزێکی تر کە پێوەی ماندووبووە بەتایبەتی هەردوو برای بەڕێزم کاك (هێمن قادر) و کاك (سەفین دەلۆیی) و هەر کەسێکیش کەلێی سوودمەند دەبێت و بە نزایەکی خێر بەسەرمان دەکاتەوە. و دڵەکانمان جگە لەڕەزامەندی خۆی لەهەر مەبەست وئامانجێکی تری بێ بەها پاك بکاتەوە.

.

.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

پرۆفیسۆر

د. خالید موحەممەد صاڵح

بەکرەجۆی تازە/ تەلاری ئامەد/ شوققەی ژمارە (٥)

ڕۆژی پێنج شەممە/ کاژێر ٤:٢٣ خولەکی سەر لەبەیانی

٢٤/١٠/١٤٤٠ - ٢٠١٩/٦/٢٧

## پێڕستی سەرچاوەكان

١- البجيرمي (سليمان بن محمد بن عمر البُجَيْرَمِيّ)، حاشية البجيرمي على شرح المنهج، مطبعة الحلبي، ١٩٥٠.

٢- البخاري (محمد بن إسماعيل)، صحيح البخاري، دار طوق النجاة، ط١٤٢٢،١، تحقيق: محمد زهير بن ناصر.

٣- البنك الإسلامي للتنمية، المعهد الإسلامي للبحوث والتدريب، الجعالة والإستصناع.

٤- البهوتي (منصور بن يونس البهوتي)، كشاف القناع عن متن الإقناع، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤١٨، ١٩٩٧، تحقيق: محمد حسن محمد حسن..

٥- البيهقي(أحمد بن الحسين)، السنن الكبرى، مجلس دائرة المعارف النظامية الكائنة في الهند ببلدة حيدر آباد، ط١، ١٣٤٤.

٦- الترمذي (محمد بن عيسى)، سنن الترمذي، دار إحياء التراث العربي، بيروت، تحقيق أحمد محمد شاكر وآخرون.

٧- إبن تيمية (أحمد بن عبد الحليم)، إقتضاء الصراط المستقيم في مخالفة أصحاب الجحيم، ط٧، دار عالم الكتب، بيروت، ١٤١٩،١٩٩٩، تحقيق: ناصر عبد الكريم العقل.

٨- إبن تيمية (أحمد بن عبد الحليم)، الفتاوى الكبرى، دار المعرفة، بيروت، ط١، ١٣٨٦، تحقيق: حسنين محمد مخلوف.

٩- إبن تيمية (أحمد بن عبد الحليم)، مجموع الفتاوى، مجمع الملك فهد لطباعة المصحف الشريف، المدينة المنورة، ط، ١٩٩٥، تحقيق : عبد الرحمن بن محمد بن قاسم.

١٠- إبن حبان (محمد بن حبان)، صحيح إبن حبان، مؤسسة الرسالة، بيروت، ط٢، ١٩٩٣، تحقيق: شعيب الأرنؤوط.

١١- إبن حجر الهيتمي (أحمد بن محمد بن علي)، تحفة المحتاج في شرح المنهاج، المكتبة التجارية الكبرى، مصر، ط١٩٨٣.

١٢- د.حسين حسين شحاتة، بحث بعنوان الضوابط الشرعية للسمسرة والسماسرة، سلسلة بحوث ودراسات في الفكر الإقتصادي الإسلامي.

١٣- الحطاب، مواهب الجليل شرح مختصر خليل، بيروت، دار الفكر، ١٣٩٨هـ، ط٢،.

١٤- الخطيب الشربيني، مغنى المحتاج الى معرفة معاني الفاظ المنهاج، مطبعة مصطفى البابي الحلبي وأولاده، مصر.

١٥- إبن خلدون، المقدمة، دار إحياء التراث العربي، القاهرة.

١٦- أبو داود (سليمان بن الاشعث السجستاني)، سنن أبي داود، دار الفكر، بيروت، تحقيق: سعيد محمد اللحام.

١٧- زكريا بن محمد بن أحمد الأنصاري، فتح الوهاب، بيروت، دار الكتب العلمية، ١٤١٨هـ، ط١،.

١٨- الشوكاني، إرشاد الفحول إلى تحقيق الحق من علم الأصول، دار الكتاب العربي، بيروت، ط١٩٩٩، تحقيق: أحمد عزو.

١٩- د. شوقي أحمد دنيا، بحث بعنوان المتاجرة بالهامش، رابطة العالم الإسلامي، الدورة (١٨) للمجمع الفقهي.

٢٠- طاهر حيدر حردان، مبادئ الاستثمار، دار المستقبل للنشر والتوزيع، ١٩٩٧.

٢١- د. عبد الله بن إبراهيم بن علي، التطبيقات المعاصرة للجعالة و أحكامها في الفقه الإسلامي.

٢٢- إبن عبد البر (يوسف بن عبد الله)، الإستذكار، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، تحقيق: سالم محمد عطا، محمد علي.

٢٣- علي محيي الدين القره داغي، بحث بعنوان أحكام المتاجرة في العملات، هيئة المحاسبة والمراجعة للمؤسسات الإسلامية، المعايير الشرعية ١٤٢٨هـ-٢٠٠٧م.

٢٤- د. غادة غالب يوسف، السمسرة بين الواقع والقانون دراسة مقارنة بين القانون التجاري المصري والقانون التجاري الأردني.

٢٥- إبن قدامة، المغني، بيروت، دار الفكر، ط١، ١٤٠٥هـ.

٢٦- الكاساني (أبو بكر بن مسعود)، بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤٠٦،١٩٨٦.

٢٧- الإمام مالك، المدونة، دار الكتب العلمية، بيروت، ط٥، ١٤١٥، تحقيق: زكريا عميرات.

٢٨- الماوردي، الحاوي الكبير في فقه الشافعي، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٩٤.

٢٩- أحمد ياسين القرالة، حكم الهبة وموانع الرجوع فيها في الفقه الإسلامي، مجلة الدراسات، علوم الشريعة والقانون، ج٣٢، ع١، ٢٠٠٥.

٣٠- مجلة المجمع الفقهي الإسلامي، العدد الحادي عشر، ج١، ص٤٣١، القرار رقم: (١٠٢) (١١/٥).

٣١- مجلة المجمع الفقهي الإسلامي، العدد الثاني، ج٢، ص٧٣٥ و٨١٣. القرار رقم (١٠ ) (٢/١٠).

٣٢- محمد بن إبراهيم السحيباني، بحث بعنوان آليات نقل الملكية في الأسواق المالية، بحث مقدم للمؤتمر العالمي الثاني للاقتصاد الإسلامي بكلية الشريعة والدراسات الإسلامية جامعة أم القرى، مكة المكرمة، ١٤٢٤هـ.

٣٣- د. محمد صالح جابر، الاستثمار بالأسهم والسندات وتحليل الاوراق المالية، مؤسسة الخليج للطباعة والنشر.

٣٤- محمد بن عبد الواحد السيواسي، شرح فتح القدير، بيروت، دار الفكر، ط٢.

٣٥- مسلم (مسلم بن الحجاج) ، صحيح مسلم، دار إحياء التراث العربي، بيروت، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي.

٣٦- د منير إبراهيم هندي، الأوراق المالية وأسواق المال، منشأة المعارف، ٢٠٠٦.

٣٧- النووي، (يحيي بن شرف النووي)، روضة الطالبين، دار الكتب العلمية، بيروت.

٣٨- النووي (يحيي بن شرف النووي)، شرح النووي على صحيح مسلم (المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج)، دار إحياء التراث العربي، بيروت، ط ١٣٩٢.

٣٩- إبن هبيرة (يحي بن هُبَيْرَة بن محمد)، اختلاف الأئمة العلماء، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ٢٠٠٢، تحقيق: السيد يوسف أحمد.

٤٠- أبو يعلى (محمد بن الحسين بن محمد)، الأحكام السلطانية، دار الكتب العلمية، بيروت، ط٢، ٢٠٠٠، تحقيق: محمد حامد الفقي، ص١٨١.

٤١- أبو يعلى (أبو الحسين ابن أبي يعلى)، طبقات الحنابلة، دار المعرفة، بيروت.

٤٢- https://ar-ar.facebook.com/alqaradghi.

٤٣- https://www.youtube.com/watch?v=_qTkpaqqgy٤.

٤٤- https://www.youtube.com/watch?v=vl٧TxJdLL٧U.

٤٥- https://www.youtube.com/watch?v=hA٥s٧bEfT٠I.

٤٦- https://drive.google.com/file/d/0B1tr6WIdzmFVSGdCRzBDUGw4SHc/view.

٤٧- https://www.alarbcoin.com/٢٠١٦/٠٦/Onecoin.html.

٤٨- https://www.albayan.ae/opinions/articles/2017-12-25-١,٣١٤١٦٠٢، https://www.borsaforex.com/.

٤٩- http://onelifearabic.blogspot.com/٢٠١٧/.

٥٠- https://www.hespress.com/hi-tech/336583.html

٥١- https://thealkhabir.blogspot.com/٢٠١٦/٠٥/onecoin.eu.html، https://slideplayer.com/slide/١٣٠٦٢٨١٣/.

٥٢- http://pharmakone.blogspot.com/2016/12/blog-post_18.html

٥٣- https://www.bestmlmmarketing.com/.

٥٤- http://www.dictionary.com/browse/ponzi.https://www.sec.gov/fast-answers/answersponzihtm.html.

٥٥- http://www.apintertrust.com/offshore_company/belize_tax_haven.htm

٥٦- http://www.nasdaq.com/article/survey-malaysians-warm-up-to-cryptocurrencies-bitcoin-still-on-top-cm٧٩٨١٤٦.

٥٧- https://cointelegraph.com/news/one-coin-much-scam-onecoin-exposed-as-global-mlm-ponzi-scheme.

٥٨- http://www.mgforex.com/arb/forex-trading/content/rollover-interest.htm.

٥٩- http://www.forexyard.com/ar/margin-leverage.

# پێرستی بابەتەكان

ئەم پەڕتووکە سێ توێژینەوەی زانستی لەخۆ دەگرێت لەسەر سێ بابەتی شەرعی، یاسایی، زانستی، دارایی، بازرگـانی، ئابـووری سەردەمییانە کە مـاوەیـەکـە هـەموو ئـەو نـێوەنـدانەیان بەخۆیانەوە سەرقاڵ کردووە ئەوانیش بابەتەکانی:

١- حوکمی مامەڵەکردن بە دراوە ئەلکترۆنییەکانەوە (OneCoin) بەنمونە.
٢- حوکمی بەشداریکردن لە کۆمپانیاکانی (بازارگەری تۆربەندی) (Network Marketing) (الـتسـويـق الشـبكي) (Qnet) بەنمونە.
٣- حوکمی مامەڵەکردن لە بازاڕی (Forex) و کـارکـردن بە سـیستـەمی پەراوێزی بازرگانی (Margin).

ئەوەی لەم توێژینەوەیەدا هەیە بۆ ئەو کەسانەیە کە حساب بۆ حەڵاڵ وحەرام وسنورەکانی شەرع وقیامـەتی خۆیان دەکەن، ئەگینا ئـەوانەی گوێ بە حەرام وحەڵاڵ نادەن مەبست نین بەم بابەتانە وقسەکـانیـش ئاراستەی ئەوان نییە.

گرنگە هەر موسوڵمانێك دەیەوێت هەر کارێك بکات پێویستە سەرەتا بۆچوونی شەرعی لەسەر بزانێت و پاشان بڕیاری کردن یان نەکردنی بدات چونکە شەرعی خوا لەسەرو حەز و بەرژەوەندی هەموو لایەکەوەیە.

مەبەسـتی سـەرەکی توێژینەوەکان ڕزگارکردنی ئەو گەنجە سـادە و خەڵکە بێ ئەزموونەیە کەدەکەونە داوی دەستبڕینی ئەم کۆمپانیایانـەوە و وزە و تواناکانیان ئیفلیج دەکەن و داهات و دەستمایەکانیان بەهـەدەر دەبەن ئەمە جگە لەوەی کە ئەم جۆرە کۆمپانیایانە زیان بەئابوری وڵاتیش دەگەیەنن و پارەیەکی بێ شوماری ئەم وڵاتە ڕەوانەی کۆمەڵێك ژمارەی حسابی نادیار و بانکی بێ ناسنامە دەکەن.